ناوی کتێب: کۆیلایەتی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا
ناوی نووسەر: حسن علی بۆسکێنی
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنــوێن
دیزاینی تێکست: زەردەشــت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢
چــاپ: نـاوەندی ڕێنـوێن
تیــــراژ: (١٠٠٠) دانــــە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (    )ـی ساڵی (٢٠٢٢)ـی پێ دراوە.








**ناوەندی ڕێنوێن**


07511408868 - 07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

## پێشکەشە

• بە دایک و بابی خۆشەویستم کە هیواو ئاواتیان ئەوە بوو ئێمە لەسەر ڕێگای ڕاست بین و خزمەت کاری دین بین. باوکم لە ١٩٩٤ گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار خوای گەورە لێی خۆشبێ و بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات وە دایکیشم لەسەر جێگایە وە تەواو بێ تاقەت بووە، خوای گەورە و میهرەبان شیفای بدات و سەلامەتی بکات.

• کاك سوهەیبی کورم، کە زۆر ماندوو بوو بە تایپ و هەڵەچنیەکەیەوە.

# پێشەکی

الحمد لله الذی علم بالقلم، علم ا لانسان مالم یعلم، والصلاة والسلام علی نبیه الاکرم، وعلی آله وأصحابه أولی المکارم والهمم.

بابەتی کۆیلایەتی بابەتێکە لە کۆن و تازەدا جێگای مشت و مڕ بووە، وە ڕاجیایی زۆری لەسەر بووە، ئەوانەی لەسەر ڕواڵەتی دەقەکان و ڕووداوەکان وەستاون بەردەوام لای توندیان هەڵبژاردووە، وە ئەوانەش تەماشای ڕوح و مەقاسیدی دەقەکانیان کردووە فراوانتر بابەتەکە یان تاوو توێ کردووە و گەیشتونەتە ئەنجامی باشتر و ڕاستر، چوونکە حووکمە شەرعیەکان لە حیکمەت و هۆکار خاڵی نین و ئامانج دارن کاتێک لە ئامانج و مانای دەقەکە تێناگەی ناتوانی فەتوایەکی واقعی دروست سەبارەت بە شتەکە بدەی. بابەتی کۆیلەش لە نێوان ئەم ڕواڵەت و ئامانجەدا بۆتە جێگای مشت و مڕ، هەر چەندە بابەتی کۆیلە جیاوازترە چونکە دەقەکان بە ڕواڵەت و ئامانجەوە بەلای شەرعی نەبوون و ناڕەوایی کۆیلەکردن دان زیاتر بۆیە دەبوو ئەوەندە جێگای ڕاجیایی نەبا، وە بەڕاستی بە کۆیلەکردن سیستەمی نەفامی ستەمکاری دایهێناوە نەوەک ئیسلامەتی و دینداری، ئیسلام وەک گرفتێکی مرۆیی و کۆمەڵایەتی سەیری کردووە نەوەک فەخر و شانازی و کاری باش،

دەبێ بەڕاستی گلەیی ئەوەش لە زانایانمان بکەین کە دەرگایان بۆ کردۆتەوە و دەستی دەسەڵاتدارەکانیان واڵاکردووە بۆ دووبارە و چەند بارە دروست کردنەوەی کۆیلە، وە مێژووی ئیسلامیش خاڵی نییە لە بە کۆیلەکردن و ستەم کردن لە کۆیلە، ڕاستە لە ناو کۆیلەکاندا خەڵکی



گەورە و زانا و دانا و سەرکردە و شاعیر و داهێنەر و هونەرمەند و پاشا هەڵکەوتووە وە لە مێژووی ئیسلامیدا زیاتر لە دوو سەدوو پەنجا ساڵ حوکمیان کردووە و لووتی تەتەر و مەغۆل و خاچ پەرستەکانیان شکاندووە، بەڵام ناوی کۆیلاتیان لێ نەبۆتەوە و بە کەسی ئاسایی سەیر نەکراون. هەرچەندە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کۆیلایەتی بە مانا کلاسیکیەکەی نەماوە بەڵام بە شیوازی نوێ جۆرەها کۆیلایەتی پەیدا بووە، بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئێستاش بابەتی کۆیلایەتی بە چاک و ڕەوا دەزانرێ و بەرگری سەر سەختانەی لێدەکرێ لە لایەن زانایان بە گشتی و ڕەوتی سەلەفی و تەکفیری بەتایبەت، ئەمەی کە نووسیومە لەم چەند لاپەڕە هەوڵێکە بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتی کۆیلە، وە خوێندنەوەیەکی سەردەمیانە و واقیعیانە بۆ بابەتی کۆیلە، هەوڵمانداوە حوکمە شەرعیەکەی لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەتدا ڕوون بکەینەوە، هۆکاری سەرەکی بۆئەم نوسینە ورووژاندنیەتی لە لایەن مولحیدەکانەوە و نەبوونی وەڵامی تەواو قەناعەت پێکەر لە لایەن زانایانی سەردەمەوە، بەڵێ شتی جوانیش نووسراوە بەکوردیش هەیە سوپاس بۆ خوا بەڵام هێشتا پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاترە و دەبێ زیاتر دەمی ناحەزان بە بەڵگەی شەرعی ببەسترێ و مسوڵمانانیش زیاتر دڵیان ئاو بخواتەوە.

حسن علی بۆسکێنی

# پێشەکی

## م. صلاح الدين أحمد

بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

بەکۆیلەکردن بە هاتنی ئیسلام لاواز بوو و نەما، ئەمە بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی ئیسلام دژی بەکۆیلەکردنە و دەیان ڕێگەی داناوە بۆ نەهێشتنی، نەمانیشی لە کۆمەڵگەی موسڵماناندا بەڵگەیە لەسەر ئەمە.

هەموو قورئان و سوننەت بگەڕێی دەقێکت دەست ناکەوێت هانی بەکۆیلەکردن بدات، یان ڕێی بۆ خۆش بکات، یان دەرگای لەسەر واڵا بکات، بەڵکوو ئەمسەر تا ئەوسەری بریتییە لە کەمکردنەوە و نەهێشتن و ڕێکخستن و کۆتاییپێهێنان و دەستەبەرکردنی ماف بۆ کۆیلە، بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێت کە ئیسلام بۆ هەموو شتێک بڕوای بە پلەبەندی هەیە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە کۆندا و تا سەدەی بیستیش ڕێگەی بە بوونی کۆیلە داوە و بە شتێکی سروشتی سەیریان کردووە، بۆ نموونە لە ئەسینای یۆنانی کۆندا کە شوێنی فەلسەفە و ... بووە، لە کۆی چوار سەد هەزار دانیشتوو، دوو سەد و پەنجا هەزاری کۆیلە بووە و سەد و پەنجا هەزاری ئازاد بووە!

بۆیە ناکرێ ئیسلام بێت و ڕاستەوخۆ ئەو هەموو مێژووە دوورو و درێژە بەلا بنێ و شیرازەی کومەڵگە تێک بدات، چونکە لەبنهێنانی سیستەمێکی ڕەگداکوتاو وا ئاسان نییە، بۆیە ئیسلام هات پێش هەموو شتێک هانی نەدا، ئینجا لە بەرانبەردا هانی ئازادکردنی دا و چەندان حوکمی شەرعی و کەفارەتی بەستەوە بە ئازادکردنی کۆیلە، ئینجا

دوایی لە قورئاندا بەتەواوی ڕێگەی لێ گرت و دوو ڕێگەی دانا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا، کە هیچیان بەکۆیلەکردن نییە، کەواتە ئەوەی هەبووە بریتی بووە لە بەسەرداکەوتنی ئیسلام بۆ سەر ئەم بارودۆخە نەک داهێنانی، بەڵام بەداخەوە نەیاران و دڵ نەخۆشان و ناحاڵییان کۆیلەیان بە ئیسلامەوە بەستۆتەوە، وەک ئەوەی مێژووی کۆیلایەتی لەگەڵ ئیسلامدا دەستی پێکردبێت، بێئاگا لەوەی یان خۆبێئاگاکردن لەوەی کۆیلایەتی مێژووەکەی زۆر کۆنە و ئیسلام هات بە پلەبەندی نەیهێشت و لەبنی هێنا و تا ئەوکاتەی هەشبووبێت هەموو مافەکانی مرۆڤی بۆ کۆیلە دەستەبەر کردووە و وەک مرۆڤ سەیری کردووە، بەڵام ئەوانەی ئێستا ئەو ڕەخنانە لە ئیسلام دەگرن نیو ئەوەندەی ئەو مافەی ئیسلام داویەتییە کۆیلە نایدەن بە مرۆڤە ئازادەکان چجای کۆیلەکان، ئەوەتا هەموو مرۆڤایەتییان کردۆتە کۆیلەی سیستەمە ستەمکارەکانی وەک سەرمایەداری و ... هتد، ئەوەتا وڵات نەما داگیری نەکەن و سەرخان و ژێرخانی نەبەن و نەیدزن، وڵات نەما نەیکەنە کۆیلەی قەرزەکانیان و دەیان نەوەی داهاتووشی پێوە نەفەوتێنن، ئەوەتا تەنها لە دوو جەنگی جیهانیدا حەفتا ملیۆن مرۆڤیان کوشت، ئەوەتا بە ناوی ئازادییەوە هەر ڕۆژە و وڵاتێک داگیر دەکەن و مرۆڤەکانی دەکەن بە کۆیلەی خۆیان و ئامانجەکانیان، ئەوەتا هەزاران دامەزراوەیان دامەزراندووە بۆ مامەڵەکردن بە ئافرەت و کڕین و فرۆشتنیان و لەشفرۆشی پێکردنیان لەژێر ناوی بریقەدار و جیاجیادا، ئەوەتا سەدان و هەزاران باندی مافیاییان داهێناوە بۆ ڕفاندنی منداڵ و فرۆشتنی ئەندامەکانیان و لەشفرۆشی پێکردنیان و بەکۆیلە کردنیان، ئەوانە و سەدان تاوانی دیکە دژی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ئەنجام دەدەن، بەڵام دێن شتێک کە ئیسلام نەیهێشتووە بە ملی دادەن! کەواتە



کۆیلایەتی ئەگەر جاران جۆرێک بووبێت ئێستا دەیان و سەدان جۆرە لەژێر ناو و ناونیشانی بریقەداردا!

ئەوەی ڕوونە ئەوەیە کە قورئان و ژیاننامەی سەروەرمان ﷺ و ڕووحی شەریعەت و مەقاسیدی شەریعە و بنەماکانی ئیسلام دژی بەکۆیلەکردنن و لەگەڵ مرۆڤبوونی مرۆڤ و ئازادیدان، ئیسلام هاتووە مرۆڤەکان لە بەندایەتی بەندەکان ببات بۆ بەندایەتی خودا، نەوەک بەپێچەوانەوە، چونکە کەسێک بەندەی مرۆڤێک بێت بەئاسانی بەندایەتی خودای پێناکرێت.

ئەوەی دەمێنێتەوە بریتییە لە کۆیلایەتی لە توراسی ئیسلامی و مێژووی موسڵماناندا، کە دیارە هەم توراس و هەم مێژوو پیرۆز نیین و هیچ زانایەکیش نەیگوتووە پیرۆزن، وە هەردووکیشیان بە سروشتی خۆیان دەکەونە ژێر کاریگەری کات و شوێن و ژینگە و بارودۆخ، بۆیە ئەوەی هەبووە و وتراوە و کراوە ناکرێ بکرێتە ماڵ بەسەر خودی ئیسلام و خودا و پێغەمبەر ﷺ، لە کۆتاییدا هەمووی ئیجتیهاد و تێڕوانین بووە بۆ سەردەمی خۆیان، بۆیە زۆر هەڵەیە بە تەرازووی ئێستا وتەکانیان بپێوین، چونکە هی ئەوانە مامەڵەکردن بووە لەگەڵ باردۆخی ئەوکاتی خۆیان، چونکە کۆیلایەتی سیستەمێکی جیهانی بووە و موسڵمانانیش بەهۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ وڵاتان و شارستانییەکان، وە بوونیان لە کۆمەڵگەیەک کە کۆیلایەتی ڕیشەیەکی دوور و درێژی هەبووە، نەیانتوانیوە ڕاستەوخۆ ئەوە تێپەڕێنن، لە کۆتاییشدا نەمانی کۆیلایەتی لە کومەڵگەی موسڵماناندان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیسلام دژی کۆیلایەتییە.

هەڵوێستی دروستیش بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ توراس و کەلەپوردا بریتییە لە ڕێزگرتن و سوود لێ بینین و ئاوڕدانەوە بۆی، بەڵام

بەبێ تەقدیس و پیرۆزکردن، چونکە هەمانە توراس پیرۆز دەکات! هەشمانە سووکی دەکات و هیچ ڕێزێکی بۆ دانانێت! بەڵام لە ڕاستیدا هەردووکیان هەڵەن، بەتایبەت ئەم بابەتانە دەچنە ناو چوارچێوەی مێژوویی و سیاسەی شەرعی و عورف و عادەتی کۆمەڵگەکان، بۆیە هەموو ئەو بابەتانەی لەم چوارچێوەیەدا بن، نابنە ئەسڵی دین و لە بنەما نەگۆڕەکان هەژمار ناکرێن و دەچنە چوارچێوەی ئیجتیهاد و ئیجتیهادی سیاسییەوە، بۆیە گشتاندنی هەموو بابەتە توراسی و فیقهییەکانی زانایان ـ کە لە سەردەم و شوێن و باردوخێکی دیاریکراودا دراون ـ بۆ هەموو کات و سەردەمێک هەڵەیەکی مەنهەجی و کوشندەیە، غەیری کوشتنی ڕووحی ئیسلام و شەریعەت و نەبینینی واقیع هیچی دیکەی لێ ناکەوێتەوە، بۆیە پێویستە ئێمە ئاوڕێک لە ڕابردوو و ئەزموون و توراسی زانایان بدەینەوە ـ چونکە گەورەترین و جوانترین توراس و کەلەپووریان جێهشتووە، لەگەڵ ئەوەی شتیشی تێدابێت کە بۆ ئێستا گونجاو نەبێت ـ بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئێستا و داهاتووش نادیدە نەگرین و لەبەر چاومان بێت و واقیعبین بین و بگەڕێینەوە بۆ ڕووحی ئیسلام و مەقاسید و فەلسەفەی شەریعەت.

لە کۆتاییدا زۆر دەستخۆشیم هەیە بۆ مامۆستای دانا و زانا جەنابی م. حەسەن عەلی، کە هەستا بە نووسینی ئەم توێژینەوە و پەرتووکە جوان و پێویست و واقعییە، کە بەڕاستی زۆر جوان بۆ بابەتەکان چووە و هەموو هەوڵەکەشی بۆ بەرگریکردن بووە لە خودا و قورئان و پێغەمبەر و ئیسلام و موسڵمانان و ڕەواندنەوەی گومان و پرسیار لەبارەی ئەم پرسەوە، مامۆستا حەسەن نموونەی زانای قووڵ تێگەیشتوو و واقیعی و مەقاسیدییە، هەردەم هەوڵ دەدات بۆ ڕاڤەکردنی قورئان و سوننە ئیسلام بەشێوەیەکی جوان و واقیعی و مەقاسیدی و دووربوون لە شلڕوەی

و توندڕەوی، خوای گەورە زیاتر سەرکەوتوو و سەرفرازی بکات و موسڵمانانیش زیاتر لە فکر و بیروبۆچوونە جوانەکانی بەهرەمەند بکات.

صلاح الدين أحمد

٢٢٠٢/٤/٥٢

# بەشی یەکەم

باسکردنی کۆیلایەتی بەشێوە کلاسیکیەکەی لەم سەردەمەدا بۆ؟ لەکاتێکدا کۆیلایەتی شێوازەکەی لەمڕۆدا زۆر گۆڕاوە. ئەوە لەبەر ئەوەیە مولحیدەکان گوێ بە سەردەم و گۆڕانکاری دونیا و شتە هەنووکەیەکان نادەن، ئەگەر باوی شتێک نەمێنێ ئەوان هەر باسی دەکەن چوونکە ئامانجیان ئەوەیە ڕەخنە لە ئیسلام بگرن، جا گرنگ نییە بابەتەکە چیە، مولحیدی وا هەیە دەیان جار باسی کۆیلەی کردووە، یان دووبارەی کردۆتەوە هەر بۆ ئەوەی بڵێن ڕەخنە گرە، وە دەیان جار ئەوبابەتە وەڵام دراوەتەوە بەدرێژی و بەکورتی لە ڕابردوو وە لە ئێستادا، منیش دەمەوێ ئەم بابەتە بە خوێندنەوەی خۆم باس بکەم بە سوود وەرگرتن لەو بابەتانەش کە لەو بارەوە نوسراون لەسەرچاوە کۆن و تازەکان، بەڵام سەرچاوەی هەرە بەهێز قورئان و فەرموودەیە. دەکرێ ئێمە لە چەند بابەتێکدا وەڵامی ئەم بابەتە گرنگە بدەینەوە و ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەین.



## کۆیلایەتی لە ڕوانگەی زمانەوانی و زاراوەی شەرعی دا

کۆیلایەتی واتای چ دەگەیەنێ؟ راغب ی ئەسفەهانی لە کتابە بەناو بانگەکەی بە ناوی (مفردات ألفاظ القرآن) دەربارەی بەندایەتی دەڵێ:

عبد: العبودية إظهار التذلل، والعبادة أبلغ منها لأنها غاية التذلل ولا يستحقها إلا من له غاية الافضال وهو الله تعالى ولهذا قال(ألا تعبدوا إلا إياه) والعبادة ضربان: عبادة بالتسخير وهو كما ذكرناه في السجود، وعبادة بالاختيار وهي لذوي النطق وهي المأمور بها في نحو قوله (اعبدوا ربكم – واعبدوا الله) والعبد يقال على أربعة أضرب : الأول: عبد بحكم الشرع وهو الانسان الذي يصح بيعه وابتياعه نحو(العبد بالعبد – وعبدا مملوكا لا يقدر على شئ). الثاني: عبد بالايجاد وذلک ليس إلا لله وإياه قصد بقوله(إن كل من في السماوات والأرض إلا آتي الرحمن عبدا). والثالث : عبد بالعبادة والخدمة، والناس في هذا ضربان: عبد لله مخلصا وهو المقصود بقوله): واذكر عبدنا أيوب إنه كان عبدا شكورا – نزل الفرقان على عبده – على عبده الكتاب – إن عبادي ليس لک عليهم سلطان – كونوا عبادا لي – إلا عبادک منهم المخلصين – وعد الرحمن عباده بالغيب – وعباد الرحمن الذين يمشون على الأرض هونا – أن أسر بعبادي ليلا – فوجدا عبدا من عبادنا ) .وعبد للدنيا وأعراضها وهو المعتكف على خدمتها ومراعاتها وإياه قصد النبي عليه الصلاة والسلام بقوله « تعس عبد الدرهم ، تعس عبد الدينار » وعلى هذا النحو يصح أن يقال ليس كل إنسان عبدا لله فإن العبد على هذ بمعنى العابد، لكن العبد أبلغ من العابد والناس كلهم عباد الله بل الأشياء

كلها كذلك لكن بعضها بالتسخير وبعضها بالاختيار وجمع العبد الذي هو مسترق عبيد، وجمع العبد الذي هو العابد عباد، فالعبيد إذا أضيف إلى الله أعم من العباد . ولهذا قال ( وما أنا بظلام للعبيد ) فنبه أنه لا يظلم من يختص بعبادته ومن انتسب إلى غيره من الذين تسموا بعبد الشمس وعبد اللات ونحو ذلك. ويقال طريق معبد أي مذلل بالوطء ، وبعير معبد مذلل بالقطران.

## بەندایەتی دەكات بە چوار بەش:

**یەكەم:** بەندایەتی بەمانای كەسێكی ئازادە بە حوكمی شەرع كە دەتوانێ كڕین و فرۆشتن بكات، وە ئەو جۆرەیان كۆیلەش دەگرێتەوە وەک خوا دەفەرمووێ: العبد بالعبد، یان دەفەرموێ: عبدا مملوكا لايقدر على شئ.

**دووەم:** بەندایەتی بە مانای بەدیهێنان دێ كە ئەوە بەس مافی خوایە، چونكە خوای گەورە بەدیهێنەرە بۆ هەموو بوونەوەر.

**سێیەم:** بەندە بە مانای خۆساغ كردنەوە و یەكلا كردنەوە، جا چ بۆ خوا بێ یان بۆ دونیا بێ.

**چوارەم:** بە مانای زەلیل و مل كەچی دێ دەوترێ، (طريق معبد، إبل معبد)، ڕێگایەک كە زۆر بكوترێتەوە و پێڕۆی زۆر پێدا بڕوا خۆڵەكەی ورد دەبێ و تەخت دەبێ، یان وشترێک لە ڕێگایەكی دورەوە بێ و باری گران بێ و ئەولا و لا نەكا و مل كەچ بێ و ڕام بێ[١].

لە كتاب التعريفات ی ئیمامی جورجانی ئەوا پێناسەی رق دەكات: الرق في اللغة الضعف ومنه رقة القلب وفي عرف الفقهاء عبارة عن عجز

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٤٢

حكمي شرع في الأصل جزاء عن الكفر أما أنه عجز فلأنه لا يملك ما يملكه الحر من الشهادة والقضاء وغيرهما وأما أنه حكمي فلأن العبد قد يكون أقوى في الأعمال من الحر حسا[١]

**رق:** لە زمانەوانیدا بە واتای لاوازی و نەرمی دێ، دەوترێ دڵ نەرم یان دڵ ناسک، بەڵام لە زاراوەی شەرع زانان بریتییە لە دەستەوستانیەکی حووکمی لە ڕووی شەرعیەوە دانراوە وەک سزایەک بۆ کوفر، بۆچی دەستەوستانە؟ چوونکە ئەوەی کەسێکی ئازاد لەبەر دەستیدایە ئەو لەبەر دەستیدا نییە و خاوەنداری ناکا، لە شایەتی دان و قەزاکردن و غەیری ئەمانە، بۆ یە دەڵێین لە ڕووی حوکمیەوە دەستەوستانە، چوونکە جاری وا هەیە بە کردەیی بەهێزترە لە کەسی ئازاد بەڵام لەڕووی حووکمی خاوەنی خۆشی نییە.

خاوەنی کتابی (التوقيف على مهمات التعاريف) لە پێناسەی (عبد) ئەوا دەڵێ: العبد يطلق على مملوک الرقبة بطريق شرعي، وعلى المخلوق للعبادة، ومن ثم كان قول المتواضع: العبد يقول كذا، أولى من قوله: المملوک؛ إذ المخلوق عبد على كل حال، والمملوک لغير سيده مجاز ان قصده وإلا فكذب[٢].

واتا وشەی عبد: بەکاردێ بۆ ئەوکەسەی بەندەی کەسێکی ترە بە ڕێگەی شەرعی، ئەستۆی لە دەستی کەسێکی تردایە، وە بەکاردێ بۆ ئەو کەسەی دروست بووە بۆ بەندایەتی، کەواتە کەسێکی خۆ بە کەمگر کە دەڵێ بەندە وا دەڵێ شایەنترە لەوەی کە بڵێ (مملوک) وا دەڵێ واتە ئەو کەسەی مولکی کەسێکی ترە، چونکە درووستراوەکان

---

(١) كتاب التعريفات، على بن محمد بن على الجرجانى ص١٠٥

(٢) التوقيف على مهمات التعاريف، ص٣١٢

بەندەن لە هەموو کاتێکدا، بەڵام وشەی(مملوک) بۆ غەیری گەورەکەی خۆی حەقیقەت نییە مەجازە، ئەگەر مەبەستی گەورەکەی خۆی بوو دەنا بۆ غەیری گەورەکەی بڵێ من(مملوکم) درۆیە. گرنگ ئەوەیە بەندە بە چەندین واتا هاتووە، بەندە بە مانای گەردن کەچی و مل کەچی یاسا گشتیەکانی خوا دێ، ئەوە هەموو درووستکراوێک بەندەیە واتە: (العبودیة بالتسخیر). بەڵام بەندایەتی بە ئارەزوومەندانە ئەوە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە مل کەچی و فەرمانبەریی خوا دەکەن، یان بۆ هەر کەسێکی تر، بەڵام بەندایەتی بەمانای کۆیلایەتی ئەوە بەو کەسە دەڵێن کە لە ژێر دەسەڵاتی غەیری خۆی دایە و گەورەکەی دەتوانێ بەکاری بێنێ، کە مەبەستی زیاتر ئەو جۆرە بەندایەتیەیە، بەڵام کۆیلایەتی بەمانا فراوانترەکەی ئەو کەسەیە کە ئازادی خاوەنداریەتی سیاسی و ئابووری و ئایینی و بیرڕا و خێزانی و گواستنەوەی لێ سەندرابێتەوە کەواتە کەسی کۆیلە خاوەنی خۆی نییە لە ڕووی خاوەنداریەتی، سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، هەتا بیرووباوەڕ، بیرووڕا، خێزانی، گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە ڕووی سەربازی، کۆیلە شەڕو ئاشتی بەدەستی خۆی نەبووە بەڵکوو خاوەنی هیچی خۆی نەبووە، یان لانی کەم لەم بوارانە ئازادی تەواوی نەبووە: عبد، مملوک، رقیق، قن، امة، هەموو ئەوانە ناون بۆ کۆیلە.

# بەشی دووەم

## ئاوڕدانەوەیەك بۆ كۆیلایەتی
## لە مێژوی ئەوروپا و ئەمریكا و ئەفریقا دا

بە ئاوڕدانەوەیەکی کەم لە مێژوو دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە کۆیلایەتی یەکجار باو بووە لە هەموو دونیادا، وەک پێشتر ئاماژەم پێکرد، وە خراپترین جۆری کۆیلایەتی لە ئەمریکا و ئەوروپا و ئەفریقا بووە، هەر چەندە ئەفریقا زیاتر قوربانی بووە لەوەی کە چەوسێنەر بووبێ بەڵام دەسەڵاتدارەکانی ئەفریقاش هاوکار بوون بۆ کۆیلە درووست کردن و ڕفاندن و فرۆشتن.

باسی کۆیلایەتی لە ئاسیادا لە میانەی بەندایەتی لە مێژوی ئیسلامدا باس دەکەم.





## کۆیلایەتی و ڕەشەکوژی لە ئەمریکا

پشکنەری بەناوبانگی ئیتالی(کریستوفر کۆلۆمبس ) سەرەتایەکی نوێ بوو بۆ نەهامەتی و نەگبەتی خەڵکی هەردوو ئەمریکا کە بە هیندە سورەکان ناویان دەرکرد، کە لەڕاستیدا ئەوان هیندی سوور نەبوون بەڵکوو ئەمریکی ئەسڵی بوون دواتر زۆربەیان لەناو بردران.

جۆرج فلۆیدی ئەمریکی ڕەش پێستی بەرەگەز ئەفریقی تەمەن ٤٦ ساڵ لە کاتێک پۆلیس لە(منیا بولس ) گرتیان و بۆ قۆڵ بەستکردنی پۆلیسەکان زۆر بە وەحشیانە ئازاریان داو بۆ ماوەی نۆ دەقە قاچیان خستە سەر ملی هەتا دڵی لە لێدان کەوت، وە نەشیان هێشت کەس بەرگری لێبکا، وە هەتا ڕێگایان نەدا چارەسەری سەرەتاییشی بۆ بکرێ، ئەمە شۆرش و نارەزایەتیەکی گەورەیی لە هەموو جیهان بە گشتی و ئەمریکا بەتایبەت و ڕەش پێستەکان بە تایبەت تر لێکەوتەوە، ئەو ڕووداوە ئەوانی بردەوە بۆ مێژووی ڕەشی کریستۆفەر کە ئەمریکیەکان هەرگیز لەبیری ناکەن، بۆیە لە زۆربەی شوێنەکان پەیکەری کریستۆفەریان شکاندو فڕێیان دەدایە سەر ئەرز و ناو ڕووبارەکان.

کۆلۆمبۆس لەڕێی دەریای ئەتڵەسی گەیشتە جەزیرەکانی کاریبیە لە ساڵی١٤٩٢ بۆ یەکەم جار بە مەبەستی دۆزینەوە و شارەزایی لەو شوێنە، وە بۆ جاری دووەم بە جەیشێکی گەورەی ئیسپانی لەساڵی ١٤٩٨ چۆ ئەو شوێنە، سەرەتا ئەو هەژارانە پێشوازی گەرمیان لێکردن، بەڵام ئەوان پەرستگاکانیان وێران کردن،ماڵیان تاڵان کردن، هەتا



مردووەکانیان دەردێنایەوە لەبەر ئەوەی بەشێک لەوان زێریان لەگەڵ دەگۆڕ نرابوو ئەمە نەریتیان بوو، وە کوشتارێکی بێ ڕەحمانەیان لەگەڵدا بەکارهێنان، هەتا وایان لێهات لەبەر ئیهانەو ستەمی ئەوان بەشێکیان خۆیان دەکوشت، وە ئافرەت و منالانیان لە کوخەکانی خۆیاندا ئاگردەدا، وە ئەگەر کەسێکیش هەڵاتبا و ویستبای خۆی ڕزگارکات لەدەرەوە پارچە پارچەیان دەکرد، هەتا کوشتاریان ئەوەندە زۆر لێکردن لەهەشت نەفەر تەنیا یەک کەسیان دەردەچوو ئەوەش کە ڕزگاری دەبوو لە کانە بەردین و خەڵوزەکان بە زۆرە ملێ و بێ کرێ کاریان پێدەکردن، بەڕاستی مێژوویەکی رەشی ئەورووپایە لە گەڵ ئەمریکیە ئەسڵەکان، کە ئەم نەنگیە تا دەمرن دەبێ عەرەقی شەرمەزاری لەبەر بڕێژن، چوونکە ئەورووپا بە گشتی و ئیسپانیا بە تایبەت مێژووی ڕەشتری بۆخۆی تۆمار کرد.

بەڕێژەی سەدی ژمارەی ئەوانەی لەساڵی ١٧٠٠-١٨٢٠ لە ئەفریقیەکان ڕاگوازران بۆ ئەمریکا لە ویلایەتی(لویزیانا) لە ئەمریکای باکور:

- سنغامبیا(ماندینکا، فولا، الولوف) ١٤.٥٪
- سیرالیون(مندي، تيمنا) ١٥,٨٪
- ساحل العاج(ماندی، کرو) ٥,٣٪
- غولد کوست(اكان، فون) ١٣,١٪
- خليج بنين(اليوروبا، إيوي، فون، اللادا، ماهي) ٤,٣٪
- خليج بيافرا(إيجبو، تكر، ايبيبيو، بميليكا، بوبي) ٢٤,٤٪
- وسط أفريقيا(كونغو، مبوندو) ٢٦,١٪
- شرق أفريقيا (ماكو، مدغشقر) ١,٨٪

لە ساڵی١٧٨٧ لە دەستووری ئەمریکی موسادەقە کرا لە سەر کۆمەڵێک بەند کە پەیوەندی بە کۆیلەوە هەبوو لەوانە، بابی نۆیەم، لە مادەی یەکەم دان دەنێ بە دەستوری بوونی کۆیلایەتی.

لە بابی دووەم، لە مـــادەی چـــوارەم قەدەغـــە دەکا یارمەتی کۆیلە هەڵاتووەکان بکرێ.

وە دەڵێ دەبێ قەرەبووی ئەوانە بکرێتەوە کە کۆیلەکانیان ڕایان کردووە.

مادەی پێنجەم ڕێگە دەگرێ لەهەر هەموار کردنێک کە بەسەر بازرگانی کۆیلەدا بکرێ، هەتا ساڵی١٨٠٨ز تا ئەم بەروارە ئەم مادە دەستووریانە هەبوون، هەرچەند هەوڵ لە ئارادابووە بۆ ئەوەی لە دەستوردا کۆیلایەتی نەهێڵرێ بەڵام تا ئەو بەروارە ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو. دیارە لەدوای ئەمە جوڵانەوەکانی ئازادی بۆ کۆیلە برەوی سەندوو تا بە یەکجاری ئیلغا بۆوە لەدەستوردا، بەڵام مانای ئەوە نییە کە دەمارگیری بەرامبەر ڕەش پێستەکان کۆتای پێ هاتووە، دەبینی لە مێژووی هەموو ئەمریکا بێجکە لە(باراک ئۆباما) ی ڕەش پێست هیچ کەسێک لە وان نەبووە بەسەرۆکی ئەمریکا کە ٤٤ سەرۆکی ئەو وڵاتە بوو لە ساڵی ٢٠٠٩-٢٠١٧.

بەکورتی چەوسانەوەی ڕەش پێستەکان لە ویلایەتەکانی ئەمریکا بەدەست سپی پێستەکان هەزاران لاپەڕی لەسەر نووسراوە وە هەتا ئێستاشی لەگەڵدابێ جیاکاری زۆرە، وە ڕووداوەکەی(جۆرج فلۆید) کە ئەو تەقینەوە گەورەی بەدووی خۆیدا هێنا ڕوونترین بەڵگە بوو لە سەر سیاسەتی جیاکاری لە ئەمریکا.

## کۆیلایەتی لە ئەوروپا[(١)]

ئەوروپا هەر گرفتی ئەوەی نەبووە کە کۆیلەی هەبووە وەک لە دونیای ئەوکات باو بووە بەڵکوو بە کۆیلەکردن و ڕفاندنی ملیۆنان کەس لە ئەفریقا و کردنیان بەکۆیلە و ڕاگواستنیان بۆ وەڵاتانی ئەورووپی و بەکارهێنانیان بە زۆرە ملێ و بێ ڕەچاوکردنی ماف و پێدانی کرێ گەورەترین تاوان بوو کە کردیان لە مێژویی مرۆڤایەتیدا.

لەسەدەکانی ناوەڕاست ئەو هەموو شەڕە ناوخۆیەیی کە ڕوویدا لە ئەوروپا وای کرد کە ژمارەی کۆیلە زۆر زیاتر بێ، چوونکە گەورەترین و خێراترین و کاریگەرترینی پەیدابوونی کۆیلە شەڕەکان بوون.

وە لە ئەسینا گەورەترین بازاری کۆیلە فرۆشی هەبووە، وە هیچ سەر ژمێریەکی تەواو لەبەر دەست دا نییە بۆ ژمارەی کۆیلە لە ئەوروپا و بەکۆیلە کراوەکانی ئەفەریقی بەڵام دەوترێ چەندین ملیۆن بوونە، وە هەتا باس لە زیاتر لە چل ملیۆن کۆیلە دەکرێ، ئەمەش جێگای سەر سووڕمان نییە چوونکە ئەم فراندن و بە کۆیلەکردنە لە سەردەمی کۆلۆمبۆسەوە دەستی پێکردووە تا سەدەی نۆزدە و بەولاوەتریش، ئیسپانیا و بەریتانیا و فەرەنسا و پۆلۆنیا و پورتوگال پشکی شێریان بەرکەوتووە لەم ڕفاندن و بە کۆیلەکردنە، بەتەنیا فەرنسا بۆ ماوەی ٥٠٠ ساڵی ڕابردوو دەستی گرتووە بەسەر زیاتر لە ٣٢ دەوڵەوتی

---

(١) الرق فى ماضيه و حاضره.
الرق والرقيق في العصور القديمة والجاهلية والاسلام/الدكتورة فاطمة قدورة الشامى.



ئەفەریقی داو ئەگەر بە ناو و ڕەسمیات کۆیلە نەبووبن ئەوە بە کردەیی هەر کۆیلە بوون، وە هەموو داهات و ژیانیان بۆ فەرەنسیەکان بووە، جا بریتانیا کە خاوەنی دوو لەسەر سێی دونیا بووە زۆر خەراپتر بووە، وە ئەڵمانیا ئیسپانیا بەپێی دەرفەت و مەجال درێغییان نەکردووە.

## کۆیلایەتی لە ئەفریقا

ئیبن بەتووتە دەگێڕێتەوە کە لە ناوەڕاستی سەدەی چواردە سەردانی ئەفەریقای کردووە، باسی وڵاتی مالی دەکات و دەڵێ خەڵک لەوێ پێشبڕکێیان بووە لەسەر ئەوەی داخوا کێ کۆیلەی زیاترە، وە هەتا ئیبن بەتووتە خۆی بەندەیەکیان پێدابوو وەک هەدیەی میوانداری، ئەوە دەگەیەنێ کە بەندایەتی سنووری نەبووە لە زۆریدا.

### چەندین جۆری بەندایەتی هەبووە لە ئەفەریقا لەوانە:

**١.** عبودیة الاسترقاق: ئەم جۆرەیان ئەوە بووە کە بەندە پەیوەندی لەگەڵ گەورەکەی وەک پەیوەندی کەل و پەلێک وابووە بە کەسێکی ئازاد و خاوەن، بەندە خاوەنی هیچ نەبووە، کڕدراوە، فرۆشراوە، بەخشراوە، بازرگانی پێوە کراوە کە ئەمە خراپترین جۆری بەندایەتی بووە لە هەموو دوونیا باو بووە.

**٢.** الخدمة المنزلية: بەو جۆرە بەندانە وتراوە کە لە ماڵی گەورەکەیان خزمەتی ماڵەوەیان پێکراوە، وە تا ئەندازەیەک ڕێز و ئازادیان بووە، وە لە حاڵەتی ناچاریدا نەبێ بازرگانی و کڕین و فرۆشتنیان پێ نەکراوە، وە توانیویانە ژن بێنن و شوو بکەن و هەندێک لە قازانجی کارەکانیان دەست کەوێ.

**٣.** عبودیة الدیون أو الرهونات: ئەم جۆرە بەندایەتە زەمانی دانەوەی قەرز بووە، تا ئەو کاتە کەسی قەرزار قەرزەکەی داوەتەوە کەسی خاوەن قەرز،

بە زۆر منداڵی کەسی  قەرزداری بەکار دێناو کاری پێدەکرد، یان کەسێکی تر لە کەس و کاری قەرزدارەکە تا ئەوکاتەی قەرزەکەی دەگەڕاندەوە.

**٤.** العبودیة العسکریة: ئەوەیان ئەو جۆرەیان بووە کە دەسەڵات حکوومەت لە شێوەی یەکەی سەربازی بەکاری هێناون و شەڕی پێکردوون، ئەوانە کاریان سەربازی بووە و بۆ ئامانجی سەربازی بەکار هاتوون.

**٥.** عبودیة القرابیین: ئەم جۆرە بەندایەتییە لە ئەفریقا باو بووە تا سەدەی نۆزدە کە کۆمەڵێک بەندە لە شێوەی ئیعدام کردن دەکران بە قوربانی ئەم جۆرە باو بووە لە ئیمپراتۆریەتی(بنین) کە ئێستا( غانا) ی پێدەڵێن، وە هەروەها لە باشوری(نەیجیریا).

**٦.** تجارة الرقیق المحلیە: ئەم جۆرە بەندایەتیە لە زۆربەی ئەفریقادا باو بووە، کە دەسەڵاتدار و کۆمپانیا زەبەلاحەکان هەڵدەستان بە گرتنی خەڵک و دەیان کردن بە کۆیلە بە ئامانجی بازرگانی پێوە کردن و فرۆشتنیان بە ئەوروپا بۆ جووتیاری و کانە خەڵوزەکان و کارگە جۆراو جۆرەکان چوونکە دەیان گووت ئەفریقیەکان بە هێزن و ئازان، ئەم کارە نەشیاوە لە سەردەمی دۆزینەوەی ئەمریکا دەستی پێکرد تا ساڵانی ١٨٠٠زاینیی.

کەواتە ئەفریقا پشکی شێری بەرکەوتووە لە چەوساندنەوە و بە کۆیلە کردن بە بەراورد بە کیشوەرەکانی تر.

## کۆیلایەتی لە کیشوەری ئاسیا

دەوترێ کۆیلایەتی لە ئاسیا بە گشتی و وەڵاتی دوو ڕووبارەکان دەگەڕێتەوە بۆ پێش چاخی نووسین، واتە زیاتر لە دە هەزار ساڵ پێش میلاد، دیارە تا ئەو کاتەی مرۆڤ نەکەوتۆتە سەر کشتوکاڵ ئەوەندە پێویستی بەدەستی کار نەبووە و ئەوەندە کۆیلایەتی باو نەبووە، بەڵام دووای ئەوەی کە مرۆڤ کەوتە سەر کشتوکاڵ پەنای بۆ بە کۆیلەکردن بردووە، واتە چینایەتی دەستی پێکردووە، وە پشتیوانی ئەو بۆچوونە زۆر بە ڕوونی لە قورئانی پیرۆز هەست پێ دەکەین، قورئان بۆ مان باسی چەوساندنەوە دەکا لە نەتەوەکانی نوح و هود و سالح و لووت و شوعەیب، لە هەموو ئەو گەلانەدا چەوسانەوە و چینایەتی هەبووە هەتا ئەو پەڕ، ئەگەر نموونە بە قەومی نوح بێنینەوە کە قورئانی پیرۆز بۆمانی تۆمار کردوە دەفەرموێ: فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ هود

واتە: جا ئەو دەستە دەسەڵاتدارەی کە بێباوەڕ بوون لە هۆزی نوح وتیان: ئێمە تۆ تەنها وەک یەکێک لە خۆمان دەبینین و نابینین ئەوانەی شوێنی تۆ کەوتوون جگە لەوانەی کە هەژار و داماوەکانمانن و دووربین نین و ژیریان کەمە و سادەن، هەروەها نابینین ئێوە هیچ شتێکی زیاترتان بەسەر ئێمەدا هەبێت، بەڵکو ئێمە وا گوومان دەبەین ئێوە درۆزنن.

دەبینین زۆرینەی دەسەڵاتداران گاڵتە بە کەمینەی بڕوادار دەکات و بە کەمینە و فامکاڵ ناو زەدیان دەکەن.

ئەمە بەڵگەی چەوساندنەوە و چینایەتی و بەندایەتییە، وە خوای گەورە باسی گەلی (سەموود)مان بۆ دەکات و دەفەرموێ:

قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ الأعراف

واتە: (دوای ئەو یاد خستنەوانەی ساڵح پێغەمبەر) دەستەی دەسەڵاتداران، ئەوانەی لووت بەرزیان کرد لە قەومەکەی وتیان بەوانەی کە چەوسێنراونەتەوە، لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوە: باشە ئێوە دەزانن کە ساڵح لەلایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانە کراوە؟! ئیمانداران وتیان: بە دڵنیاییەوە ئێمە باوەڕدارین بەو پەیامەی کە بەودا ڕەوانە کراوە.

دەبینین گەلی سەمود بوونە دوو دەستە بە دەقی قورئان بوونە چەوسێنەر و چەوسێنراوە، ئەمەش پاڵپشتی بوونی چەوساندنەوە و چینایەتی دەکا.

وە لەگەلی شوعەیبیش بە ئاشکرایی ئەمە هەست پێ دەکەین وەک دەفەرموێ: قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَٰكَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ هود

واتە: وتیان ئەی شوعەیب ئێمە تێناگەین لە زۆرێ لەوەی تۆ دەیڵێیت بەڕاستی ئێمە تۆ بە لاواز دەبینین لەناوماندا خۆ ئەگەر(لەبەر) خزمەکانت نەبووایە دڵنیابە بەرد بارانمان دەکردی(چونکە) تۆ خۆت هیچ دەسەڵاتێکت نیە لە بەرامبەر ئێمەدا.

دەبینین گەلی (شوعەیب) باسی بێ دەسەلاتی شوعەیب دەکەن وە ئەگەر لەبەر هۆزەکەی نەبا بەردبارانیان دەکرد.

وە دەبینین گەلی (موسا) کە نەوەکانی ئیسرائیل بوون بە دەست فیرعەونیەکان کرابوونە کۆیلە وەک موسا دەفەرموێ:

وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ الشعراء

واتە: (وتلك نعمة تمنها علي) موسا ئەیەوێ کارەکەی فیرعەون کەم نرخ و بێ منەت بکات، بۆیە ئەڵێت: تۆ منەتی ئەو بەخێو کردنەیشم دەخەیتە سەر، بێگومان من ئەوە بە نیعمەت و پیاوەتی دانانێم (أن عبدت بنی إسرائيل) چوونکە تۆ نەوەکانی یەعقوبت هەموو کردۆتە کۆیلە و خزمەتکاری خۆت؟!.

گومان لەوەدا نیە کۆیلایەتی لە چین و یابان و کۆریا و هیندستان و هەموو وڵاتانی ئاسیادا بە چڕی هەبووە.

## کۆیلایەتی لە مێژووی ئیسلامی

من بەداخەوە دەڵێم کە کۆیلایەتی لە مێژووی ئیسلامیدا هەبووە و هەندێک جار زۆر بەر فراوانیش بووە، لەڕاستیدا ئەمە چەند هۆکارێکی هەبووە لەوانە:

**١.** فراوانخوازی لە دەسەڵاتدا کە مەلیکەکان پێشبڕکێ یان تێدا کردووە.

**٢.** لاسایی کردنەوەی دووژمنانی دین لە فارس و ڕۆمەکان.

**٣.** فەتوای زانایانی ئایینی ئەم بابەتەی تەواو شەرعاندووە و کردوویانەتە بنچینە(أصل) لە هەڵس و کەوت لەگەڵ کافراندا.

**٤.** هۆکارێکی تر مامەڵە کردنی هاوشێوە بووە، کاتێک دووژمنان و بێباوەڕان ئەمەیان کردووە ئەوانیش وەک تۆڵە سەندنەوە و وەڵام دانەوەی هاو وێنە ئەوەیان کردووە.

**٥.** هۆکارێکی تر ئەویش ئەو فەتوایەیە کە کەنیزەک سنووری نیە چەندت حەز لێبێ دەتوانی بێنی، ئەو فەتووایە ڕێک لە گەڵ هەوەسی دەسەڵاتدارەکان یەکی گرتۆتەوە و کاریان پێکردووە و بەدینیان زانیوە بە پاڵ پشت بەو ئایەتە کە لەسوەتی(النساء) دا هاتووە کە دەفەرموێ:

وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴿٣﴾ النساء

واتە: ئەگەر لەمەڕ کیژە هەتیوەکانەوە، لەوە ترسان کە نەتوانن بە تەرزێکی حەق و ڕەوا دەگەڵیان بجووڵێنەوە، دەتوانن وازیان لێ بێنن و ژنانی تر - چەندی خۆتان پێتان باشە و پێتان دەشێن - مارە بکەن: دووان بن یان سێ یان پێکەوە، یا چواریش بن هەر ڕەوایە. ئەگەر ترسان کە نەتوانن ژنەکانتان وەکوو یەک تماشا بکەن، با یەکێک بێ وەل ئەوانە ڕابووێرن کە بوونەتە موڵکی خۆتان. بۆ خۆ لە غەدر پاراستن، ئەمە کاری پەسندە.

دیارە ئەو ئایەتە باسی ژمارەی کەنیزەکەکانی نەکردووە کە بۆ مسوڵمان حەڵاڵن کە بەیەکەوە کۆیان بکاتەوە، ئەم ئایەتە بۆتە بنچینەی ئەو فەتوایە کە چەند کەنیزەک بێنی ڕەوایە کە لەڕاستیدا وانیە ئەم بۆ چوونە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە کە لەهەمان سورەتدا باسی کردووە، ئەو ئایەتە بە ڕەهایی نیە بەڵکوو بەستراوەتەوە بە پێی پێویستی، بەڵکو نابێ کەنیزەک هەر بێنی ئەگەر تواناى هێنانی ئافرەتی ئازادت هەبێ، وە ئەگەر هێناشت لەبەر زەرووری دەبێ یەک دانە بێنی چونکە ئەو بنچینەیە کە دەڵێ(الضرورة تقدر بقدرها) زۆر ڕاست و ڕەوایە، هەتا بە یەکێک کارت پێک بێ نابێ پەنا بۆ دووەم بەری ئەمە حەقیقەتی قورئانە کە دەفەرموێ:

وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٥﴾ النساء




واتە: ئەوەش کە نەیتوانی لە ئێوە لەبەر دەست کورتی، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدار مارە بکات، ئەوە با لە کچە کەنیزەکە ئیماندارەکانتان بخوازێت، خوایش زانایە کە ڕادەی ئیمانتان چەندە و چۆنە، ئێوە هەندێکتان لە هەندێکتانن (هەمووتان لە ئادەم و حەوان و ئەم جیاوازیە چینایەتیە شتێکی کاتی یە) لەبەرئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندی کەس و کارو خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، لەکاتێکدا ئەو کەنیزەکانەش پێویستە پاک داوێن بن و دووربن لە داوێن پیسی و دۆست گرتنەوە، خۆ ئەگەر شوویان کردوو لەوەودوا داوێن پیسیەکانیان ئەنجامدا ئەوە نیوەی سزای ئافرەتانی سەربەست دەدرێن(چونکە ئازادیی تەواویان نەبووە لەو سەردەمەدا) لەبەر ئەوە مارەکردنیان بۆ ئەوانەتانە کە دەترسێت تووشی هەڵەو گوناهـ ببێت، خۆڕاگریتان(تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە) چاکترە بۆتان، خوایش لێخۆشبوو و میهرەبانە.

دەبینین کە دەبێ لە ناچاری کەنیزەک بێنی مادام ناچاری بێ نابێ ئەگەر کارت بەیەک پێک بێ پەنا بۆ دووەم بەری، وە هەروەها دەش فەرمووێ ئەگەر زەواجیان لەگەڵ نەکەن و خۆڕاگر بن باشترە، دیارە تەفسیرەکان دەڵێن بۆچی کەنیزەک نەهێنی باشترە، ئەوە بۆ ئەوەیە زنجیرەی کۆیلایەتی درێژ نەبێتەوەو بنەبڕ بێ، سبحان الله ئایەتەکە چەند ڕوونە و ئاشکرایە کەچی بەداخەوە زانایان ئەوا بەڕەهایی باسی کەنیزەکیان کردووە و بازاڕیان بۆ مەلیکە دەسەڵاتدارەکان گەرم کردووە.

**٦.** هۆکارێکی تر ئەو فەتوایەیە کە کەنیزەک و کۆیلایەتی پاداشتی تێکۆشانی تێکۆشەرانی ئیسلامە بۆیە مافی خۆیانە چەند کەنیزەکیان هەبێ.



٧. یەکیتر لەو بۆچوونە هەڵانە ئەوەیە کە بەندایەتی بۆ کافرەکان سزای خوایە بۆ ئەوان لەبەر ئەوەی بەندایەتی بۆ خوا ناکەن بۆیە دەبێ بەندەی خەڵکی تر بن، ئەو زانا بەڕێزانە لە بیریان چووە ئەوە قەیناکا ئەوە سزای کافرانە کەوانیە، بەڵام ئەدی بۆ سزای ئەوانە دەدەی کە بەندەی خوان و هەموو قورئانیان لەبەرە و نوێژ و ڕۆژووی سوونەتیان هەیە!؟.



## ڕەخنە لەخۆ گرتن، یان پینەکردن کامەیان باشترە!؟

**١.** ڕاستی لە مێژوویی ئیسلامیدا پڕیەتی لە شتی جوان و نموونەی جوان، وە دەشتوانم بەدڵنیایی بڵێم مێژوویی ئیسلامی بە بەراورد لەگەڵ بەرامبەرەکانیان بەراورد ناکرێ لەگەڵ مامەمەڵەی جوان لە گەڵ نەیار و بەندەکان، ئەم ڕاستییە نەیاران و مێژوو نووسان و ڕۆژهەڵات ناسەکانیش دانیان پیّدا هێناوە.

**٢.** مێژووی ئیسلامی وە هەڵس و کەوتی مسوڵمانان کاریگەر بە مامەڵەی وەک بەرامبەر، بۆیە ئەوانیش بەمافی خۆیان زانیوە ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە کردوویانە لە بەکۆیلەکردن.

**٣.** دەبێ ئەوە بڵێین لە مێژووی ئیسلامیدا لادان و زیادە ڕەوی و ستەمی زۆر بووە بەتایبەت بەرامبەری کۆیلە لەلایەن دەسەڵاتدار و سەرکردە و پادشایەکان .

**٤.** دەبێ بڵێین مێژوو پیرۆز نیە و موقەدەس نیە ئەوەی موقەدەسە تەنیا وەحی خوایە لە قورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەری ئازیز علیه الصلاة والسلام.

**٥.** ئەوروپاییەکان لە ئێمەی مسوڵمانان بە مەوقیف تر بوون لە مەڕ بڕیاردان بۆ ئازاد کردنی کۆیلە و جێگیرکردنی لە پەیمان نامە و دەستورەکانیاندا، بەڵام بەداخەوە وڵاتانی ئیسلامی لە ژێر فشاری ئەوروپا و بەکاتێکی

درەنگەوە دانیان نا بە ئازادکردنی کۆیلە، ئەوە لەکاتێکدا دینی ئێمە لە پێش ئەوروپا باسی ئازادکردنی کۆیلەی کردووە.

٦. بەداخەوە دەڵێم، ئێمە کەلتور و کەلەپوری زانایانمان لێ بووە بەدین، ئەوان مافی خۆیانە لەسەر دەمی خۆیان قسەی خۆیان هەبێ بەڵام دەبێ زانایان لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سونەت، وە بەپێی مەقاسیدی شەریعەت و واقعی ئەمڕۆی کۆمەڵگا دەبێ قسەی خۆیان هەبێ، ئەمە بێ ئەدەبی نیە بەرامبەر بە ئەوان بەڵکو جێ بەجێکردنی قسەی ئەوانە، چونکە ئەوان وابوون بۆچون و فەتوای خۆیان هەبووە بۆیە دەبێ ئێمەش بۆچوونی خۆمان هەبێ .

٧. بابەتی کۆیلە ئەوەندە ڕوونە کە ئیجتیهادی ناوێ چونکە شەریعەت ئازادی بە مەبەست گرتووە نەوەک بە کۆیلەکردن، بۆیە نابێ دوو دڵ بین سەبارەت بە ئازادی کۆیلە، بە پشتیوانی خوا ئەم بابەتە دواتر بەتەواوی ڕوون دەکەینەوە.

# بەشی سێیەم

## هۆکارەکانی پەیدابوونی کۆیلە

گوومان لەوەدا نیە کە کۆیلایەتی پێچەوانەی ژیانی ئاسایی مرۆڤەکانە و پێچەوانەی ئامانجەکانی شەریعەتە و پێچەوانەی حاڵەتی ئاسایی لەدایک بوونە، چونکە خوای گەورە مرۆڤەکانی بە ئازادی هێناوەتە دوونیاوە، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی کۆیلایەتی پەیدا بووە و دوونیایی تەنی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا؟





# هۆکارەکانی پەیدابوونی کۆیلە



گوومان لەوەدا نیە پەیدابوونی کۆیلایەتی چەندین هۆکاری لە پشت بووە وەک زانایان باسیان کردووە کە دەکرێ ئاماژە بە بەشێک لەم هۆکارانە بکەین.

### ١. هۆکاری ئابووری:

پەیدابوونی کۆیلایەتی بەرهەمی کۆمەڵگەی بەدەوی و دواکەوتوو نیە، چونکە هەتا ئەوکات مرۆڤ ژیان لە سەر ڕاو و شکار بووە بەیەکەوە هاوکار بوونە و وە جاری وابووە خواردن وماڵیشیان بەیەکەوە بووە، بەڵام کاتێک ئاپۆرایی مرۆڤایەتی بەرەو هەڵکشان ڕۆیشت مرۆڤ پەنای بۆ کووشتن و لەناو بردنی یەکتر برد، وردە وردە لە هێرش کردنە سەر ڕێبوار و کەسانی تری لە غەیری هۆزی خۆیان بە دیل دەکەوتە ژێر دەستیان و مامەڵەی خراپیان لەگەڵ دەکرد، دوواتر ئەم دیلە بەکۆیلە دەکراو وەک کەل و پەل و ئاژەڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکرا.

### ٢. داچاندنی زەویە کشتوکاڵیەکان و جوتیاری:

وای کردووە پێویست بوون بەدەستی کار زیاتر بێ ئەمە وای کردووە مرۆڤە بە دەسەڵاتەکان دەست بۆ گرتن و بە کۆیلەکردنی خەڵک بەرن، بەتایبەت ئەمە لەسەدەکانی ناوەڕاست و دوواتر زۆر پەرەی سەند.



### ٣. پەیدابوونی کارگە و کانە بەردین و خەڵوزەکان:

هۆکارێکی تر بوو بۆ درووست بوونی زیاتری کۆیلە، ئەمەش لە سەدەکانی ناوەڕاست کە سەرەتای درووست کردنی کارگەی لۆکە بوو وە پێویستیان بە دەستی کار زیاتر بوو، ئەمە سەرەتایەک بوو یان هۆکارێکی تر بوو بۆ درووست بوونی زیاتری کۆیلە.

### ٤. هۆکاری بازرگانی دەریایی و وشکانی:

دەوڵەت و هۆزو دەسەڵات دارەکان خەڵکیان بە زۆر دەکردە کۆیلە و بازرگانیان پێوە دەکرد، ئەم جۆرە هەر بە پاڵنەری ئابووری بووە، وە تا ئەندازەیەک لە زۆربەی وەڵاتانی دوونیا باو بووە.

### ٥. قـــەرز:

قەرز یەکێک بووە لەهۆکارەکانی پەیدابوونی کۆیلە، کەسی قەرزدار ئەگەر قەرزی بۆ نەدرابایەوە ناچار لەبەرامبەر پێنەدرانەوەی قەرزەکەی یان خۆی یان منداڵی یان خێزانی دەکردە کارەکەر و کۆیلەی بەرامبەر.

### ٦. ڕیبـا:

یەکێک لە هۆکارەکانی پەیدابوونی کۆیلە ڕیبا بووە، کەسی قەرزار ئەو ڕیبایەی دەکەوتە سەری بە هۆی قەرزەوە نەیدەتوانی بیداتەوە بۆیە ناچار لەبەرامبەردا دەکرا بە کۆیلە.

### ٧. قومـــار:

ئەویش یەکێک بووە لە هۆکارەکانی بەر فراوانبوونی کۆیلە، کەسی دۆڕاو جاری وابووە لەسەر گیانی خۆی یان خێزانی یان منالی قوماری کردووە کاتێک کە دۆڕاوە ناچار بووە توشی کۆیلایەتی ببێ.




### ٨. گـــرەو:

هەرچەند بەڕوونی باس نەکراوە بەڵام دوور نیە ئەویش هۆکار بووبێ لەهۆکارەکانی بوون بە کۆیلە لە ئەگەری دۆڕاندنی گرەوەکە.

### هۆکاری سەربازی:

• شەڕکردنی دوو دەوڵەت یان دوو خێڵ کە ڕووی داوە بۆتە هۆ کاری دیل گیران، دواتر ئەو بە دیل گیراوە  بە خودی گرتنەکە بۆتە کۆیلە.

• شەڕ بە شێوەی ڕفاندن، جا مەرج نیە بۆ ئامانجی ئابووری بووبێ لەوانەیە بە ئامانجی تۆڵە سەندنەوە بووبێ.

### هۆکاری یاسایی:

• لەزۆربەی یاساکانی دوونیا کۆیلایەتی شتێکی ئاسایی و دانپێداهێنراو بووە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە ژمارەی کۆیلە زیاتر بێ.

• لەحاڵەتی ئەوەی کەسێک یاساشکێنی بکا کەسەکە کراوە بە کۆیلە.

• یان لەحاڵەتی ئەوەی کۆیلە بەرامبەر کەسێکی تر خراپەی ئەنجام دابێ بۆ جارێکی تر کرابێتەوە کۆیلە، هەم کۆیلەبووە و هەم تاوانبار.

### هۆکاری ڕەچەڵەکی:

• کەسێک کە لە باوک و دایکێکی کۆیلە لەدایک بووبێ ئەویش دەبێتە کۆیلە.

• گەورەیەک کەنیزەکەکەی دابێتە کەسێکی تر، ئەوە هەر منداڵێک پەیدا بێ دەبێتە کۆیلە بۆ گەورەکە لەولاش خێزانی کەسێکی ترە.




## هۆکاری هەڵگێرانەوە:

• جاری وایە منالێک دۆزراوەتەوە حوکمی کۆیلەیی بەسەردا دراوەو کراوە بە کۆیلە.

• بەدوور نازانرێ کە منالی ناشەرعی کرابێتە کۆیلە، هەرچەند من ئەوەم لە هیچ سەرچاوەیەک نەبینیوە بەڵام هۆکارەکانی بە کۆیلەکردن هێندە باو بووە بۆیە بەدوور نازانرێ ئەوەش هۆکار بووبێ.

## هۆکاری جیاوازی ڕەگەزی:

دیارە بەشێک لە هۆکاری درووست بوونی کۆیلە جیاوازی ڕەگەزی بووە، وەک بە کۆیلەکردنی ڕەگەزی مێ لە لایەن ڕەگەزی نێرینە.

**هۆکاری نەتەوەیی:** وەک بەکۆیلەکردنی نەتەوەیەک بۆ نەتەوەیەکی تر، یان لانی کەم وەک کۆیلە سەیرکردن و مامەڵەکردن.

**هۆی جیاوازی ڕەنگ:** وەک چەوساندنەوەی سپی پێستەکان بۆ ڕەش پێستەکان.

**هۆکاری چینایەتی:** وەک لە یۆنان باو بووە کە جیاوازی لە نێوان چینی فەیلەسوف و حاکمەکان جیاواز بووە لە جوندی و هاوڵاتی سادە، کە کۆیلەکان تەنیا لە سادەکان و توێژی هەژارەکان بوون، بەڵام ئەوانی تر بە خۆشی ژیاون.

**هۆکاری ئایینی:** من وانازانم هیچ ئاینێک لە بنچینەدا ڕێگای بە کۆیلەکردن دابێ و خەڵکی بۆ هاندابێ، بەڵام لەدووای ئەوەی کە دینەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بۆ ڕازی کردنی دەسەڵاتدار و پاشاکان گوومانی تێدانیە ئەمە ڕووی داوە.



**١. دینی زەردەشتی:** ئەمە یاسایەکی ناسراو بووە کە کۆمەڵگا دابەش بووە بۆ دوو چین، کەدەسەڵات دار و کۆیلەکان بوون، لای هەندێکیان چینی حاکم و شەرکەرو کۆیلەبوون، لای هەندێکیان حاکم و شەرکەرو بەندە، وە هەروەها لەنەتەوەی ئاری دابەشکاری کۆمەڵگا ئاوا بووە: حاکم، شەرکەر، پیشەوەر، بەندە، بەڵام ئەوانەش کە بەندە بەشێک نەبووە لە کۆمەڵگاکە بە پێی دابەش کردنی ڕەسمی ئەوە کۆیلە هەر هەبووە لە بەشی پیشەوەر و جوتیارەکە[١].

**٢. دینی هیندوسی:** ئەوان پێیان وایە دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چین و توێژی جیاواز ئەمە کاری خوایە و ناکرێ دەسکاری بکرێ، وە ناشکرێ چینێکی نزم لە چینێکی باڵاتر ژن بێنێ، ئەم چینانەش ئەمانەن:

- براهمە
- کشاتریا
- فیشیا
- شودرا یان سودرا
- شاندالا

بەرزترینی ئەوانە بەراهمەیە دواتر ئەوەکانی تر هەرکامێک لەوان تایبەت مەندی خۆی هەیە[٢].

**٣. دینی یەهودی:**

**تەوراتی سامری:** لە ئیصحاحی ١٦ هاتووە کە(سارە) کەنیزەکی هەبووە بە ناوی (هاجرە) کاتێک بینیویەتی ئەو منالّی نابێ پێشکەشی ئیبراهیمی

(١) زرادشت والديانة الزرادشتية/ المكتبةالالكترونية الكردية/ ٦١

(٢) فيدا نصوص هندوسية مقدسة، دكتور منذرالحايک،٣٠-٣١

هاوسەری کردووە بۆ ئەوەی منداڵی ببێ و ئیبراهیم بێ پاشەوار نەبێ، وە دوای ئەوەش کە هاجەرە دووگیان بوو ئەو حەسودی پێبرد ... گرنگ ئەوەیە لێرەدا بە پێی دەقەکانی تەورات لەزەمانی ئیبراهیم دا کۆیلە هەبووە، وە هاجەرە لەو کۆیلانە بووە کە پاشای میسر بە دیاری دابووی بە سارای خێزانی ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێ[١].

**٤. دینی مەسیحی:** هەموو دەقێکی تەورات بەشێکە لە ئینجیل، چونکە ئینجیل پێکدێ لە پەیمانی کۆن و پەیمانی تازە، لە تەسنیەی ٢٠ ئایەتی ١٠-١٥ باس لەوە دەکا ئەگەر ئێوە چوون بۆ شەڕکردن لەگەڵ شارێک، یەکەم جار بانگیان کەن بۆ ئاشتەوای و سولح کردن، ئەگەر وەڵامیان دانەوە وتەسلیمتان بوون، هەموو ئەو خەڵکانەی لەو شارە نیشتە جێن دەبن بە کۆیلەی ئێوە.

**٥ . دینی ئیسلام :** دەبێ ئەم ڕاستیانە دەربارەی کۆیلایەتی لە ئیسلام دا بزانین.

- هیچ دەقێکی قورئان نییە ڕاستەو خۆ بڵێ خەڵک بکەنە کۆیلە.
- هیچ دەقێکی فەرموودە نییە بڵێ خەڵک بکەن بە کۆیلە.
- لە سوننەتی کردەیی پێغەمبەردا خەڵک کراوە بە کۆیلە لە غەزوەکاندا.
- هیچ دەقێکمان نییە نە لە قورئان نە لە سونەت، نە لە سیرە، هەتا لەدەقێکی لاوازیشدا، بەڵکو لەدەقێکی هەڵبەستراویشدا نیە بڵێ بە کۆیلەکردن خێرە، ئەمە ڕوونترین و سادەترین بەڵگەیە لەسەر خراپ بوونی بە کۆیلە کردن[٢].

---

(١) التورات السامرية، دكتور منذر الحايك ،٥٢-٥٣

(٢) زرادشت والديانة الزرادشتية\ المكتبة الالكترونية الكردية.

• بەڵام لەمێژووی ئیسلامیدا بە کۆیلەکردن بووە، بەڵکو دوای ئەوروپا کۆیلایەتی لە جیهانی ئیسلامیدا هەڵوەشاوەتەوە بەداخەوە، وە ئێستاش کەسانێک هەن هەر شانازی بە کۆیلایەتیەوە دەکەن و پێیان وایە سەردەمی شکۆی ئیسلام و پێشکەوتن بووە[١].

• کۆمەڵێک جوڵانەوە و حیزبی ئیسلامی سەردەم پێشتر لە ئەفریقا و دواتر لە شام و عێراق و کوردستانی باشوریش خەڵکیان کردە کۆیلە لە ژێر دروشمی ئیسلام و پەرچەمی لاإله إلا الله، وە بەناوی داعش، دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام، ئەمە دووبارە جەدەلی درووست بوونی کۆیلەی هێنایەوە کایەو وە سەرنجی هەموو دونیایان بەگشتی و ئەوروپا و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤیان بە لای خۆیاندا ڕاکێشا[٢].

• بەشێک لەوانەی کە بە قوڵی توێژینەوەیان لەسەر نەهامەتی بەشەرعە نەکردنی کۆیلە نەکردووە، ئێستاش لە ژێر هەیبەت و هەیمەنەی فەتوای زانایانی پێشوو ناتوانن بە ڕاشکاوی باس لە خراپ بوونی بەکۆیلەکردن بکەن، بەس لەبەر ئەوەی لە مێژووی ئیسلامیدا پیادە کراوە[٣].

ئەوەی کە باسمان کرد لەم بەشەدا تەنیا خستنە بەرچاوی هۆکارەکانی پەیدابوونی کۆیلە بوو نەوەک باسی چارەسەر، بابەتی چارەسەر لە بەشەکانی تردا باس دەکەین بە پشتیوانی خوای گەورە.

---

(١) التورات السامرية، دكتور منذر الحايك.

(٢) ڤيدا نصوص هندوسية مقدسة، دراسة مقارنة ،دكتور منذر.

(٣) الكتاب المقدس.

# بەشی چوارەم

## ئازاد کردنی کۆیلە
## لە قورئانی پیرۆزدا





## ئازاد کردنی کۆیلە لە قورئانی پیرۆزدا



سەرچاوەی یەکەم و روحی دین و مەتنی ئیسلام قورئانی پیرۆزە، با بگەڕێینەوە بۆ قورئان سەبارەت بە کۆیلە و ئازادی کۆیلە، ئەم بابەتە لە چەند خاڵێکدا کۆدەکەینەوە.

**١.** هەموو مرۆڤایەتی خاوەنی یەک خودان و یەک دروستکاریان هەیە:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ النساء

واتە: ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێک دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و(پتەوی بکەن) چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.

**٢.** هەموو مرۆڤـایەتی لە مەخـلوقیەتدا یەکسانە و هـەموو وەک یەک دروستکراوی خـوای گەورەن: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ البقرة

واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقوا و پارێزکاری بگرنە بەر.

**٣.** هەموومان یەک مەعدەن و کانن لەوەشدا جیاوازیمان نییە، هەموومان لە گڵ و توخمەکانی ناو گڵ درووست بوین: وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ الروم

واتە: لە نیشانە و بەڵگەکانی خوا ئەوەیە ئێوەی لە خاک درووست کردووە، لەوەودوا دوای بڕینی چەند قۆناغێک کوتوپڕ بوونەتە مرۆڤێک و بڵاو دەبنەوە بە زەویدا.

**٤.** هەموومان خاوەنی بەرپرسیاریەتین لە ژیانماندا: فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ الزلزلة واتە: جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەک خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە. وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ الزلزلة واتە: ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەک شەڕ و خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە.

کەواتە هەموومان بەرپرسیارین بەرامبەر کردەوەکانمان، وەڵامی چاکە چاکەیە و وڵامی خراپە خراپەیە.

**٥.** هەمووما‌ن بەیەک شێوە هاتووینە ژیانەوە بەو شێوەیەیی کە خوای گەورە بۆی داناوین:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ الحجرات



واتە: ئەی خەڵکینە بێگوومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەک درووستکردووە(کەباوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە ... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگوومان خوا زانا و ئاگایە بەهەمووان .

کەواتە هەموومان لە نیر و مێ پەیدا بووین هیچمان بە شێوەیەکی جیاواز نەهاتووینە دونیا.

٦. ئەگەر ببینە گەل و هۆز و تیرە ئەوە خوای گەورە وای کردووە دەستی ئێمەی تێدا نییە، بۆیە ئەوە هۆکاری شانازی و جیاوازیمان نییە، بە بەڵگەی هەمان ئایەتی پێشوو .

٧. جیاوازیمان بۆ یەکتر کوشتن و سڕینەوە و لەناوبردنی یەکتر نییە، بەڵکو بۆ (تعارف) یەکتر ناسین و هاوکاری کردن و کارلێکردن و پێکەوە ژیانە. بە بەڵگەی هەمان ئایەتی پێشوو.(لتعارفوا).

٨. پێوەری چاکی و خراپی لە خوا ترسان و خزمەت کردنی زیاتری خەڵکە (إن أكرمكم عند الله أتقكم). کەواتە ئەوەی چاترەو بە خزمەترە بۆ خەڵک ئەوەیان لای خوا بەڕێزترە جا کەسەکە ئازاد بێ یان کۆیلە.

٩. خوای گەورە هەموومانی پابەند کردووە بەدادگەری هەتا لەگەڵ دووژمنەکان و ناحەزەکانیشمان: يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ المائدة

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بۆ خوا ڕاست و بێ خەش بن و بە هەقانەت شایەتی دەن. دووژمنی و قینی دەستەیێک هەڵتان نەنێ بە هەقانەت ڕەفتار نەکەن. بە یەکسانی و بێ جیاوازی لەگەڵ خەڵکا ڕەفتار کردن دەبێتە هۆی پتر نزیکەوە بوون بە پارێزگاری. لە خواش ترسوو هەبێ چونکوو لە هەر کارێ ئێوە دەیکەن ئاگادارە.

ئەگەر لەگەڵ ناحەزیشمان بین دەبێ دادگەری بنوێنین، ئەمە واجبە و لەوەدا هیچ هەڵبژاردەیەکمان نیە.

**١٠.** نابێ شایەتی ناهەق بۆ نزیکترین کەسەکانیشمان بدەین: يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ النساء

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە ڕاگری دادوەری بن و شایەتیی بۆ خوا بدەن، با شایەتیەکەشتان زیانی بۆ خۆتان و دایک و باوکتان یان خزمانیش هەبێت، ئەگەر کەسانێک لەوانە دەوڵەمەندبێت یان هەژار خوا بەرژەوەندی ئەوان چاکتر دەزانێت لە ئێوە(واتە بەتەماعی دەوڵەمەندی لە دادپەروەری لامەدەن و بەهۆی نەداریی و بەزەیی بێ جێ لە حەق لامەدەن) نەکەن شوێن ئارەزووی نەفس بکەون لە دادپەروەری لابدەن، جا ئەگەر ئێوە پێچ لێ بدەن(زمان بگۆڕن) و شایەتی ناحەق بدەن، یان پشت هەڵکەن، ئەوە چاک بزانن خوا ئاگادارە بە کارو کردەوەتان.

**١١.** هەموومان بێ جیاوازی تەکلیف کراوین بە عیبادەت : يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ البقرة

واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقوا و پارێزکاری بگرنە بەر.

کەواتە بەپێی ئەوبنەمایانەی کەباسمان کرد هیچ پاساوێکمان نییە بۆ جیاکاری لەبەر ڕەنگ و ڕەگەز و پیشە و ڕەچەڵەک. ئەو بنەمایانە هەموویان ناکۆکن لە گەڵ بوونی بەندایەتی.

**١٢.** خوای گەورە لە گرنگترین و گەورەترین بابەتدا ئێمەی ئازاد کردووە کە بڕوابوون بە خودایەتی و مل کەچیە بۆ زاتی پاکی ئەو، وەک دەفەرموێ:

وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ الكهف

واتە: پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانەکراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت، بێگومان ئێمە دۆزەخێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران کە لە هەموولایەکەوە دەورەیان دەدات و دیواری بڵێسەی ئابلۆقەی داون، خۆ ئەگەر هاوار بکەن لە ئازارو تینویەتیدا، ئەوە ئاو دەدرێن بە ئاوێکی گەرمی پیس و بۆن ناخۆش کە وەکو خڵتەی کانزایی تواوە وایە، ئەوەندەش گەرمە دەم و چاویان هەڵدەکوڕوزێنێت و دەیبرژێنێت، ئای کە چەند خواردنەوەیەکی تاڵ و ناخۆشە، چەندە جێگەو ڕێگەیەکی پڕ لە ئازارە.

خوای گەورە بێجگە لە سزای دووارۆژ هیچی تری باس نەکردووە، باشە ئێمە کە لە بیرو باوەڕدا ئازاد بین ئەی بۆ لە مامەڵە کردن بە

گیان و لاشەی خۆمان ئازاد نەبین مادام هیچ زیان بە خەڵکانی تر ناگەیەنین!؟ دەی باشە ئازادیمان چ زیانێک بە خەڵکانی تر دەگەیەنێ؟

١٣. مرۆڤ بوونی تەواو لە بەکار هێنانی ئیرادەی خۆی دەردەکەوێ، دەی کە ئازاد نەبێ چۆن ئیرادەی خۆی بەکاربێنێ و بتوانێ بڕیاری درووست بدات، دەی دیارە کە بەندە خاوەنی ئەو ئیرادەیە نییە.

١٤. لادانی ستەم لە مرۆڤ نەوەک هەر کارێکی باشە بەڵکو واجبە، کەواتە دەبێ هۆکارەکانی لابردنی ستەمیش هەر واجب و پێویست بێ وەک بنچینە جوانە فیقهیەکە دەڵێ( ما لایتم الواجب الا به فهو واجب) ئەوەی واجبێک پەکی لەسەر بکەوێ ئەوەش واجب دەبێ، هیچ زەمان و گرنتیەک نییە کە گەورەکان ستەم لە کۆیلەکان ناکەن، بۆیە ڕێگری لە بەندایەتی ڕێگری کردنە لەستەم .

١٥. یەکێک لە ناشرینترین و ناقۆڵارینی ڕەفتاری بێباوەڕان ستەم و چەوسانەوەیە، گوومان لەوەدا نیە کە کۆیلە کەم و زۆر ستەمی لێدەکرێ، کەواتە با خۆمان لە رەفتاری بێباوەڕانی ستەم کار دوور بگرین، ئەگەر نا جیاوازیمان چیە؟.

١٦. موسا سەلامی خوای لەسەر بێ، بەوە فیرعەون تاوانبار دەکا کە نەوەکانی ئیسرائیلی کردۆتە کۆیلە، وەپێی دەڵێ لەبەرامبەر ئەوەی چاکەت لە گەڵ مندا کردووە هەموو نەوەکانی ئیسرائیلت کردووە بە کۆیلە، جا ئەوە چ پیاوەتی تێدایە، کەواتە خراپترین ڕەفتاری فیرعەون سەبارەت بە گەلی ئیسرائیل کردنیانە بە کۆیلە و کەنیزەک، جا چۆن دەکرێ رەفتاری فیرعەون دووبارە کردنەوە کارێکی باش بێ!.

**١٧.** مەزلومترین حاڵەتی یوسف سەلامی خوای لەسەر بێ ئەوە بووە کە کراوە بە کۆیلە و فرۆشراوە، خوای گەورە وەک تاوان لەسەر براکانی یوسف تۆماری دەکات، ئەی چۆن ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکا!:

وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّاهِدِينَ ﴿٢٠﴾ یوسف

واتە: سەرئەنجام (بردیان و) فرۆشتیان لە بازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا لە میسر، بەنرخێکی هەرزان، چەند درهەمێکی کەم، لە فرۆشتنیدا هیچ گرنگییان پێنەداو کەم تەماع بوون (چونکە پشتیان پێوەی نەئێشا بوو).

**١٨.** لە ناقۆڵاترین ڕەفتار ئەوەیە کە مامەڵە بە مرۆڤەوە بکرێ لە کاتێکدا خوای گەورە بوونەوەری بۆ خوڵقاندوە: هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾ البقرة

واتە: هەر خۆیەتی هەرچی لە زەمیندا هەیە، بۆ ئێوەی بەرهەم هێناوە و ئەوسا پەڕژایە بەرزایی و حەوت نهوومی لێ درووست کرد. هەر ئەویشە ئاگای لە هەموو شت هەیە. [پەڕژان: خەریک بوون]

**١٩.** خوای گەورە زەوی بۆ هەموو کەس درووست کردووە ئەی بۆ کۆیلەکان لێی بێبەش دەکرێن مەگەر ئەوان خەڵک نین و مرۆڤ نین؟:

وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ الرحمن

واتە: ئەم هەردەمان بۆ مەردم وەدی هێناوە. دەی باشە کۆیلە خاوەنی خۆی نیە، ئەی چۆن دەبێتە خاوەنی زەوی و خاوەنداری دەبێ؟.

**٢٠.** کۆیلە نەقس و ناتەواوییە لە تەکلیف: خوای گەورە ئەرکی بەندایەتی بە مرۆڤ سپاردووە، دەی لەبەر ئەوەی کۆیلە سەرقاڵە بە بەندایەتی بۆ

غەیری خوا ناتوانێ وەک پێویست ئەرکی بەندایەتی بۆ خوا جێبەجێ بکات، ئایا بەندە دەتوانێ ئەگەر ویستی حەج بکا، یان زەکات بدا، یان قوربانی بکا، یان عەمرە بکا، یان ماڵ ببەخشێ، دەی ئەمانە بەندایەتی نین،؟ ڕاستە دەڵێین لەسەری واجب نییە، بەڵام بۆ لەسەری واجب نیە؟ لەبەر ئەوەیە کە بەندەیە.



## ئەو ڕێگایانەی کە لە قورئانی پیرۆز دانراون بۆ ئازاد کردنی کۆیلە

**١.** هاندان بۆ بەشداری کردن لە ئازاد کردنی کۆیلە:

فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ البلد، کەچی(زۆربەی ئەو خەڵکە) نەیتوانی بەسەر کۆسپ و لەپەرەکاندا زاڵ ببێت و ڕێگای سەرفەرزای بگرێتەبەر. وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ البلد جا تۆ چووزانی ئەو کۆسپ و لەمپەرانە کامەن؟ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ البلد، ئازاد کردنی بەندە و کۆیلەیە(یان ئازاد کردنی گەردنی خۆیەتی لە گوناهو یاخی بوون و سەرکەشی).

ئازاد کردنی کۆیلە پێی دەڵێن(عتق) بەڵام ئەو ئایەتە باسی(فک) دەکا واتە کردنەوە، کەواتە ئەگەر بە چەندین کەس بەشداری بکەن لە ئازاد کردنی یەک بەندە مانای وایە هەموویان کۆسپی گەورەیان بڕیوە.

**٢.** ئازاد کردنی کۆیلە نیشانەی تەقواو و ڕاستی و چاکە کارییە.

لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ البقرة



واتە: کرداری چاک و کاری باش تەنها بریتی نییە لە ڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا(چونکە جولەکە زۆر لەسەر گۆڕانی قیبلە دووان و پڕو پاگەندەی زۆریان کرد) بەڵکو کرداری چاک و کاری باش بریتییە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بە خواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بەکتێبەکان و بە پێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی بەخشی بێت - لەگەڵ خۆشەویستیدا بۆی - بەخزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و داواکاران و لە پێناوی ئازادکرنی بەندەکاندا )هەروەها نوێژی بەچاکی ئەنجام دابێت و زەکاتیشی لە ماڵ و سامانی دەرکردبێت و ئەوانەی وەفاداربن بەپەیمانەکانیان کاتێک پەیمانیان دابێت، ئەوانەش کە لە کاتی نەداری و هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا ئارامگرن، ئا ئەوانە کەسانێکن ڕاستیان کردووە و هەر ئەوانەشن پارێزکارو خواناس و دیندارن.

کەواتە(وفی الرقاب) ئازادکردنی بەندە باشترین شتێکە کە پارەی تێدا سەرف بکرێ، وە مرۆڤ بەم ڕەفتارە دەچێتە ڕیزی ئەوانەی کە خوای گەورە پێیان دەفەرموێ ئەوانە ڕاستن و پارێزکارن.

٣.ئازاد کردنی کۆیلە لەبری شکاندنی سوێند: لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ المائدة

واتە: خوا لێتان ناگرێت کاتێک بەسادەیی سوێند بەدەمتاندا دێت و (لەسەری ڕاهاتوون) بەڵکو لەو سوێندانەتان دەپرسێتەوە کە بیرو هۆشتان لای هەبووە و بۆ مەبەستێک وتووتانە، جا کەفارەتی ئەو



جۆرە سوێندانە: نان و خۆراک دانە بە دە کەسی هەژار بەشێوەیەکی مامناوەندی کە بۆ خاو و خێزانتان سەرفی دەکەن، یاخود پۆشتە کردنەوەیان یاخود ئازاد کردنی بەندەیەک (ئەگەر بووی) ئەوەی (توانای ئەو شتانەی نەبوو) با سێ ڕۆژ بەرۆژوو بێت، ئەوە کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێک سوێند دەخۆن و نایبەنە سەر، جا تادەتوانن سوێندەکانتان بپارێزن و مەیانشکێنن، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

**شکاندنی سوێند دوو ڕێگای هەیە:**

**ڕێگەی یەکەم :** یان خواردندان بە دە هەژارە بۆ ژەمێک تێریان بکەی، یان بەرگ بۆ کردنیانە، یان بەندەیەک ئازاد بکەی، واتە کەسێ کە سوێندەکەی دەشکێنێ لە نێوان ئەم سێ شتەدا ئازادە کامەیان بکات بەردەکەوێ.

**ڕێگای دووەم:** ئەگەر هیچ کام لەوانەی یەکەمی پێنەکرا ئەوجار سێ ڕۆژ بە ڕۆژو دەبێ.

کەواتە یەکێک لە ڕێگاکانی دەرچوون لە گوناهی سوێند شکاندن بەندە ئازاد کردنە، ئەمە زۆر ڕوونە لەسەر ئەوەی کە ئازدی کۆیلە چ ئامانجێکی گەورەی ئەم شەریعەتەیە.

**٤.** زیهار: چواندنی خێزان بە دایک یان یەکێک لەمەحرەمەکان، حووکمەکەی ئەوەیە کە یەکەم جار بەندەیەک ئازاد کەی.

وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٣﴾ المجادلة

واتە: ئەوانەی وا بە هاوسەرەکانیان دەڵێن و دوایی پەشیمان دەبنەوە لەوەی کە وتویانە، ئەوە دەبێت کۆیلەیەک ئازاد بکەن پێش ئەوەی ئەو ژن و مێردە بەیەک بگەن، ئەو بڕیارە ئێوەی پێ ئامۆژگاری دەکرێت، خوایش ئاگادارە بەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن...

ئەم پیاوە لەپێش ئەوەی بگەڕێتەوە لای خێزانەکەی دەبێ ئەم کارە ئەنجامدا کە یەکەم شت ئازاد کردنی کۆیلەیە. ئەمەش ڕێگایەکی واجبە کە دەگرێتە بەر بۆ چاکسازی لە کۆمەڵگا، بۆ ئەوەی نێوانی ژن و مێر سارد و سڕی تێنەکەوێ.

**٥.کاتێک** مرۆڤ یەکێک بەهەڵە دەکوژێ دەبێ بەندەیەک ئازاد بکا وێڕای پێدانی خوێن بە خاوەن خوێنەکە: وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ النساء

واتە: بۆ هیچ ئیمانداریێک نیە ئیمانداریێکی تر بکوژێت مەگەر بە هەڵە، خۆ ئەگەر کەسێکی ئیماندار بە هەڵە ئیمانداریێک بکوژێت، ئەوە دەبێت بەندەیەکی ئیماندار ئازاد بکات و خوێن باییەکەی بدات بە کەسوکاری کوژراوەکە (وەک میراتی دابەشی بکەن) مەگەر لێی ببوورن و لە خوێنەکەی خۆش ببن، خۆ ئەگەر کوژراوەکە لە ناو قەوم و دەستەیەکدا بوو دووژمنی ئێوە بوون، بەڵام ئەو (کوژراوە) ئیماندار بوو، با (بکوژەکە) بەندەیەکی ئیماندار ئازادبکات و ئەگەر ئیماندارە کوژراوەکە لەناو قەوم و دەستەیەک بوو کە پەیمان لەنێوانتاندا هەبوو،

دەبێت خوێنبایی بدرێت بەکەسوکاری و بەندەیەکی ئیمانداریش ئازاد بکرێت، (خۆ ئەگەر بکوژەکە) ئەوەی بۆ نەلواو دەستی نەکەوت (بەندە ئازاد بکات و بەندایەتی باوی نەمابوو ماڵ و سامانیشی نەبوو) ئەوە دەبێت دوومانگ لەسەریەک بەڕۆژوو بێت، ئەمە بڕیارێکە بۆ ڕاستی و دروستی تەوبە و گەڕانەوەکەی، ئەمەش لەلایەن خواوەیە، بێگومان خوای گەورە هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە.

بڕیارەکە زۆر ڕوونە کە دەبێ کەسی بکوژ کەسێک ئازاد بکا لە بری ئەو کارەی ئەنجامی داوە. هەتا ئەگەر خاوەن خوێنەکان دووژمنی شەڕکەریش بن دەبێ بەندە هەر ئازاد بکرێ.

**٦.** بۆچی دەبێ بەندە ئازاد بکرێ لە بری کەسی بە هەڵە کوژراو؟ ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەو بکوژە با بە هەڵەش بێ کەسێکی لەناوبردووە و سرپویەتیەوە لە وجود دەبێ کەسێکی تر بێنێتە وجود، چونکە بەندەش ئازادی تەواوی نییە و خاوەنی ئیرادەو بڕیاری خۆی نییە، بۆیە ئازاد بوونی وەک لە دایک بونێکی نوێ وایە.

**٧.** ڕێگا نەدراوە مرۆڤی ئازاد کۆیلە مارەکا مەگەر بەمەرج نەبێ ئەویش ئەوەیە کە نەتوانێ ئافرەتی ئازاد بێنێ لەبەر مارەیی و مەسرەفی زۆر:

وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ النساء



واتە: ئەوەش کە نەیتوانی لە ئێوە لەبەر دەست کورتی، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدار مارە بکات، ئەوە با لە کچە کەنیزەکە ئیماندارەکانتان بخوازێت، خوایش زانایە کە ڕادەی ئیمانتان چەندە و چۆنە، ئێوە هەندێکتان لە هەندێکتانن (هەمووتان لە ئادەم و حەوان و ئەم جیاوازیە چینایەتیە شتێکی کاتی یە)، لەبەرئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندی کەس و کارو خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، لەکاتێکدا ئەو کەنیزەکانەش پێویستە پاک داوێن بن و دووربن لە داوێن پیسی و دۆست گرتنەوە، خۆ ئەگەر شوویان کردو لەوەودوا داوێن پیسیەکانیان ئەنجامدا ئەوە نیوەی سزای ئافرەتانی سەربەست دەدرێن(چونکە ئازادیی تەواویان نەبووە لەو سەردەمەدا)، لەبەر ئەوە مارەکردنیان بۆ ئەوانەتانە کە دەترسێت تووشی هەڵەو گوناهـ ببێت، خۆڕاگریتان(تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە) چاکترە بۆتان، خوایش لێخۆشبوو و میهرەبانە.

دەبینین زۆر بەڕوونی دیارە لە ناچاریدا نەبێ کەنیزەک مارە ناکرێ، کەواتە تەنیا لەکاتی پێویست و ناچاری، پێویستیش دەبێ بە ئەندازەی خۆی بێ وەک لە بنچینەکەدا هاتووە ( الضرورة تقدر بقدرها).

کەواتە ئەگەر بەیەک کەنیزەک کاری پێک بێ نابێ دوو بێنێ وە هەروەها...

وەدەبێ جیاکاری نەکرێ و خۆیان بەسەر فەرز نەکەین و بەکەمیان سەیر نەکەین چونکە هەموومان لە مرۆڤایەتیدا یەکین.

وەدەبێ مارەییان پێ بدەین و بە ڕێگا پێدانی کەس و کاری مارەی بکەین، ئەوەش هەموو شکۆ و ڕێزە بۆ کەنیزەکەکە.

٨. ئایەتەکە پێمان دەفەرموێ هەتا ئەگەر پارە و نەفەقەی ئافرەتی ئازدیشتان نەبوو، وە زۆریش پێویستان بەهاوسەر بوو هێشتا کەنیزەک



نەهێنن باشترە، بۆ باشترە؟ بۆ ئەوەی منالآن بە کۆیلەیی لەدایک نەبن و زنجیرەی کۆیلایەتی بپچڕێ و چیتر درێژ نەبێتەوە: ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْۚ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ النساء

واتە: ڕێگا پێدران بەمارەکردنی کەنیزەک ئەو کاتەیە کە بترسن و دڵنیا بن توشی زینا دەبن، بەڵام هێشتا سەبر کەن و ئارام بگرن کەنیزەک نەهێنن باشترە. هۆکارەکەش تەنیا ئەوەیە خەڵک بە کۆیلە لە دایک نەبن.

خۆزگە زانا گەورە و بەڕێزەکانمان زیاتر کاریگەر دەبوون بە مەقاسیدی قورئان نەوەک فەتوای پێشین و مێژووی رابردووی ئیسلامی، من دڵنیا بووم ئەو حەوت وشەیە بەس بۆ بۆ ئەوەی کۆتایی بەکۆیلایەتی بێ.

**٩.** بەستنی مامەڵەی ئازاد بوون لەگەڵ گەورەکان لەلایەن کۆیلەکان. وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْۚ وَلَا تُكْرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُواْ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ النور

واتە: وە دەبێ ئەوانەی کە توانای (ئەرکی) ژن هێنانیان نیە پاکژ خۆیان ڕاگرن هەتا خوا بە بەهرە (و ڕۆزی) خۆی بێ نیازیان دەکات). وە ئەوانەی داوای نوسراو دەکەن (بۆ کڕینەوەی خۆیان) لە بەندەو کەنیزەکەکانتان ئەوە نوسراویان لەگەڵدا بنوسن (بۆ کڕینەوەو ئازاد بوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەکرد (کە بریتی یە لە توانای دانی ئەو پارەی ئەبێ بیدات بە خاوەنەکەی بۆ ئازاد بوونی) وە لەو ماڵەی کە خوا بە ئێوەی داوە پێیان بدەن وە کەنیزەکەکانتان

زۆر لێ مەکەن (ناچاریان مەکەن) لەسەر زینا کردن ئەگەر ئەیانویست داوێن پاک بن تا ماڵ و سامانی ژیانی دنیاتان دەست کەوێت جا هەرکەس ناچاریان بکات (زۆریان لێ بکات) ئینجا بەڕاستی خوا دوا ئەو زۆر لێ کردنەیان لێبووردەی میهرەبانە (بەو کەنیزەکانە کە بە زۆر زینایان پێ کرا)وە.

- بەپێی ئەم ئایەتە هەموو کۆیلەکانی دونیا دەتوانن بەیەکجار لە ژێر نیری کۆیلایەتی ڕزگار بن.
- وەڵام دانەوەی گەورەکان واجبە بۆ ئەو مامەڵەیە(كتابة أو المكاتبة).
- دەبێ گەورەکان هاوکاری کۆیلەکان بن و یارمەتی مادیان بدەن ئەوەش واجبە .
- دەبێ دەوڵەت و دەوڵەمەندەکانیش هاوکار بن.
- واجبە ئەو عەقدە بە (قسط) بەش بەش بێ.

ئەو ئایەتە دەتوانێ کۆتایی بە کۆیلایەتی بێنێ ئەگەر بێت و ئێمە بمانەوێ قورئان جێ بە جێ بکەین نەوەک بۆچوونی مەزاهبی فیقهی.

**١٠.** دەبێ بەشێک لە پارەی بانکی دەوڵەت تەرخان بکرێ بۆ ئازاد کردنی کۆیلە:

إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦٠﴾ التوبة

واتە: بێگوومان زەکات تەنها بۆ هەژار و نەداران و ئەو کەسانەی کە کارمەندن بەسەریەوە و بەو موسڵمانە نوێیانەی کە هێشتا ئیمان جێگیر

نەبووە لەدڵیاندا و بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و بۆ (یارمەتیدانی) قەرزدارەکان و بۆ گەیاندنی ئاینی خوا (هەر بوارێک کە خزمەت بەبانگەوازی ئیسلام بکات و ئاینی خوا بەرەو پێش و سەرکەوتن ببات) هەروەها بۆ ئەو ڕێبوارانەش کە پارەیان لێ دەبڕێت و نەدار دەکەون(دابەشکردنی زەکات بەو شێوەیە) فەرزە لە لایەن خواوە لەگەردنی ئیمانداراندا، خواش زاناو دانایە(لە سامان بەخشین و فەرزکردنی زەکاتدا).

کەواتە دەبێ دەوڵەت لەبیری ئەوە دابێ کۆیلە نەهێڵێ، وە دەبێ پارەی پێویستی بۆ تەرخان بکات.

بابەتی کۆیلە لەقورئاندا هێشتا ماویەتی لە بەشی پێنجەم دا تەواوی دەکەین ان شاء الله.

# بەشی پێنجەم

## ڕوونکردنەوە لەسەر (ملك اليمين) و ئایەتی ٢٤ی النساء و ٥٠ی الاحزاب





## ڕوونکردنەوە لەسەر (ملك اليمين) و ئایەتی ٢٤ی النساء و ٥٠ی الاحزاب

هەندێ ئایەت هەیە لە قورئانی پیرۆزدا دەبنە مایەی ئیشکال و گوومان بۆ هەندێ کەس جا ئەو کەسانە چ مولحید بن یان مسوڵمان بن، ئەم ئایەتانە سێ جۆر ئایەتن .

**یەکەم:** ئەوانەی باسی(ملك اليمين) کەنیزەک دەکەن کە لەگەڵ هاوسەر ناویان هاتووە.

**دووەم:** ئەو ئایەتەی سورەتی النساء کە دەفەرموێ:

وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٢٤﴾ النساء

**سێیەم:** ئەو ئایەتانەی سورەتی( الاحزاب): يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٠﴾ الاحزاب

ئێمە هەوڵدەدەین بە پێی پێویست ڕوونیان بکەینەوە بە پشتیوانی خوای گەورە.

**یەکەم:** ( ملک الیمین) کەنیزەک.

ئێمە چەند ئایەتێکمان هەیە کە باسی کەنیزەکی کردووە لە چەند حووکمێکی جیاواز .

١. باسی(ملک الیمین) کراوە بۆ حەڵاڵی و سەرجێی، وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ المؤمنون

ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن. إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٦ المؤمنون

واتە: جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت، کە ئەوە جێگەی لۆمەو سەر زەنشت نیە، (لە بارودۆخی نائاسایدا بەهۆی جەنگەوە ئافرەتانی موسڵمان دەکەونە دەست دوژمنان و دەستدرێژی بێ سنوور دەکرێتە سەریان، دوور نیە ئافرەتانی دوژمن نەکەوێتە دەست ئیمانداران، ئەو کاتە تەنها یەک کەس دەبێتە هاوسەرو، بە ڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات).

لێرەدا باس لەوە کراوە کە بڕواداران دەبێ دامێنی خۆیان بپارێزن مەگەر لەگەڵ هاوسەرو کەنیزەکەکانیان نەبێ.

٢. وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٢٩ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ۝٣٠ المعارج

ئەم دوو بابەتە قسە لەیەک ڕاستی دەکا، ئەویش پاراستنی دامێنە مەگەر لە خێزان و کەنیزەکەکان نەبێ .

٣. وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ النور

واتە: وە بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش چاویان داخەن و بپارێزن (لە سەیر کردنی نامەحرەم) وە عەورەتیان بپارێزن (لە داوێن پیسی) وە جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی بە دەرەوەیە و دیارە لە جوانی (وەک دەم و چاویان و دەستیان) وە با سەرپۆشەکانیان بدەن بە سینگ و بەرۆکیاندا وە جوانی خۆیان دەرنەخەن (زیاد لەوەی دەردەکەوێت) بۆ مێردەکانیان نەبێت یا باوکیان یا باوکی مێردەکانیان یا کوڕەکانیان یا کوڕی مێردەکانیان یا براکانیان یا کوڕی براکانیان یا کوڕی خوشکەکانیان یا ئافرەتانی (ئیماندار) یا کەنیزەکە کانیان یا ئەو شوێن کەوتە و پیاوانەی کە بێ نیازن لە ئافرەت (وەک خزمەت کارو پیرو نەخۆش کە ئارەزووی ژن و مێردایەتیان نی یە) یا ئەو منداڵە کوڕانەی کە ئاگایان لە لەش (عەورەت) ی ئافرەتان نەبێت (باڵغ نەبووبن) (ئافرەتان لەکاتی ڕۆشتن دا) قاچیان نەدەن بە زەوی دا (تا دەنگی خرخاڵ و پاوانەکانیان بێت و) بزانرێت بەو جوانی یەی پێیان کە شاردویانەتەوە هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەی ئیمان دارەکان تا ڕزگار و سەرکەوتوو بن.



ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی مەحرەمەکان دەکا، وە باس لەوە دەکا ئافرەت درووستە لای کێ حیجاب نەکاو بە ئاسایی هەڵس و کەوتیان لە گەڵدا بکا، یەکێک لەو تاقمانەی کە ئافرەت درووستە لای ئەوان خۆی دەرخا و حیجاب نەکا کەنیزەکە.

**٤.** ئایەتێکی تر لە سورەتی ئەحزاب باس لە خیزانەکانی پێغەمبەر دەکا علیه الصلاة والسلام کە ئایا کێ مەحرەمی ئەوانن و دەتوانن بچنە ماڵەکانیان :

لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ الأحزاب

واتە: ئافرەتان چاوپۆشییان لێدەکرێت و قەیناکا باوانیان بیانبینن، یان کوڕەکانی خۆیان، یان براکانیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئەو ئافرەتانەیان (کە ئیشیان بۆ دەکەن لە ماڵدا)، یان ئەوکەسانەی کە لە ماڵەکانیاندا دەژین، لە خوا بترسن (ئەو سنوورانەی کە بۆی داناون مەیشکێنن)، بێگومان خوا شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

هەرچەندە ئەم حوکمە تایبەت نییە بە خێزانەکانی پێغەمبەر بەڵام لەگەڵ باسی خانەوادەی پێغەمبەردا دووبارە بۆتەوە علیه الصلاة والسلام.

**٥.** لە ئایەتێکی تردا لە سورەتی نور باسی حوکم و ئادابی ئیزن وەرگرتن دەکا لە ناو ماڵەکاندا، کە لە کاتی خۆیدا کەنیزەک و کۆیلە لەماڵەکاندا هەبووە، کە پێویست دەکا ئەوانیش لەناو ماڵدا ئەدەبی هەڵس و کەوت ڕەچاو بکەن: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ

وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٨﴾ النور

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با بەندە و ئەو منداڵانەتان(کە هێشتا نەگەیشتونەتە تەمەنی هەرزەکاری) لە سێ کاتدا (فێری ئەوە بکرێن) مۆڵەت بخوازن (لەسەردانی ژووری نووستنی ژن و مێرد) پێش نوێژی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ کە پۆشاکتان دا دەنێن (بۆ حەوانەوە)، لە دوای نوێژی خەوتنان، سێ کاتە کە لەوانەیە عەورەتی ئێوەی تێدا دەربکەوێت (با کەسی تر نەتانبینێت)، لە دوای ئەو سێ کاتە قەیناکات بۆ ئێوەش و ئەوانیش، کە بگەڕێن بە ناویەکدا و بچن بۆ لای یەکتر، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، (تا تووشی کێشەی دەروونی نەبن) خواش هەمیشە زاناو دانایە (بەوەی کە دەبێتە مایەی خێرو خۆشیتان).

### چەند ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەم ئایەتانە:

**١.** ئەم ئایەتانە باسی بوونی کەنیزەک دەکەن لەماڵەکان چ وەک هاوسەر چ وەک خزمەت کار، ئەمە ڕاستیە نابێ نکوڵی لێ بکەین.

**٢.** بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کۆیلایەتی ئیسلام دای نەهێناوە بەڵکو کۆیلایەتی لە هەموو دونیا بە گشتی ڕێگا پێدراو و یاسایی بووە.

**٣.** ئیسلام هەموو ڕێگایەکی بەکار هێنا و داهێنا بۆ ئازد کردنیان، بەڵام یەک ڕێگای هێشتەوە بۆ هێشتنەوەی کەنیزەک ئەویش شەڕ و وەڵام



دانەوەی هاو شێوەی دووژمنانی دینە ئەگەر هاتوو ئەوان دەست درێژیان کرد درووستە تۆش وەڵامیان بدەیەوە.

**٤.** بەکۆیلە کردنی مرۆڤ تاکە ڕێگا نیە لە کاتی شەڕدا بەڵکو ڕێگا هەرە خراپەکەیە کە قورئان ئاماژەی پێ نەکردووە، بەڵکو قورئان دەربارەی دیل سێ حوکمی هەیە:

**یەکەم** : کوشتن ئەگەر کەسەکە تاوانباری شەڕ بێ و ئەوان حیساب بۆ مسوڵمانان نەکەن وەک قورئان دەفەرموێ:

مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ الأنفال

واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێک ڕەوا نییە کە دیلی(لە دووژمنان) هەبێ هەتا کوشتاری زۆریان لێ نەکات لە زەویدا ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە) وە خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆ ئێوە) وە خوا تواناو زاڵی کار دروستە. ئەمە حاڵەتی یەکەمە.

**دووەم** و سێ یەم : گۆڕینەوەی بێ بەرامبەر یان گۆڕینەوە لە بەرامبەر شتێکدا جا لە بەرامبەر گیراوی مسوڵمان دابێ یان پارە بێ یان فێرکردنی زاستێک بێ. وەک قورئان دەفەرموێ: فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ ۖ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٤﴾ محمد

واتە: (ئەم فەرمانە بۆ کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەیەک لەگۆرەپانی جەنگدا) جا کاتێک گەیشتن بەوانەی بێ باوەڕ بوون، بێنە دەست لێیان

و لەگەردنیان بدەن (ئەگینا ئەوان ئێوە دەکوژن)، تا کاتێک کوشتاری زۆریان لێ دەکەن، ئینجا کەهێزیان نەما، بەدیل بیانگرن بەتوندی باڵبەستیان بکەن، ئەوسا یەکێک لەم دوو کارەیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن: یان بەپیاوەتی و منەت، یاخود بەگۆڕینەوە و فیدیە ئازادیان بکەن، تا شەر کۆتایی دێت و ئاسەواری نامێنێت و دوژمنان چەک دادەنێن، بڕیارەکە ئاوهایە، ئەگەر خوا بیویستایە خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن، بەڵام دەیەوێت بەیەکتر تاقیان بکاتەوە، ئەوانەش لەپێناوی خوادا شەهید بوون، هەرگیز پاداشتی هەوڵ و کۆششیان بەزایە نادات.

دکتۆر مستەفا زەڵمی دەڵێ تەنیا ئەم دوو ڕێگایە بۆ مامەڵە لەگەڵ دیلدا هەیە چونکە ئایەتەکە بە ئوسلوبی(حصر) هێناویەتی، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە حاڵەتی کوشتنیش بۆ دیل ماوەتەوە ئەگەر کەسەکە تاوانبار و خراپە کار و خوێن ڕێژ بووبێ، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا باسی ڕێگای چوارەم نەکراوە کە کردنە بە کۆیلە، بەڵام بۆ باسی نەکراوە؟ ئەمە ڕاستی جێگای پرسیارە، ئەوە مانای ئەوەیە قوڕئان ئەو ڕێگایەیی پەسند نەکردووە و بەچاکی نەزانیوە دەنا باسی دەکرد وەک سێ ڕێگاکانی تر.

**٥.** ئەی بۆ قوڕئان باسی کەنیزەکی کردووە وەک خێزان یان خزمەت کار؟ ئەوە مانای شەرعیەت دان نییە بە بەکۆیلە کردن؟ دەڵێین نەخێر باس کردنی مانای ئەوە نیە قوڕئان پێی باشە بەس لەبەر حاڵەتی ناچاریە چونکە لەو کاتەدا بەشێوەی بەرفراوان هەبووە، کەواتە مادام هەیە دەبێ ڕێگا چارەسەری بۆ دابنرێ، ئەویش ئەوەیە کە ڕێکخستنی بۆ بکرێ بەوەی کە مافی هاوسەر گیری هەبێ و مافەکانی تری بۆ دابین بکرێ.



**٦.** دووبارەی دەکەمەوە ئەمە ڕێگە پێدانی قورئان نییە بۆ بە کۆیلەکردن بەڵکو مامەڵە کردنە لە گەڵ ئەمری واقیع. دەنا باشتر ئەوەیە کە بێ بەرامبەر ئازادی بکەی وەک پێغەمبەر کردی لە بەرامبەر دیلەکانی بەدر و بەنو نەزیر و بەنو قەینوقاع و فەتحی مەکە و بەنی موستەڵەق حاڵەتەکانی تر.

**٧.** ئەی بۆچی زانایانی مەزهەبەکان بەڕێگایەکی مامەڵە کردنیان داناوە لەگەڵ بەدیل گیراوەکان کە بکرێن بە کۆیلەو کەنیزەک؟ لەڕاستیدا ئەمە کاریگەر بوون بووە بە حاڵەتی سیاسی ئەوکات، وە وەک مامەڵە بەهاو شێوە بووە لە گەڵ بێباوەڕاندا، وە هەڵێنجانێکی هەڵە بووە لە غەزوەکانی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام چونکە بەداخەوە ئەوەیان لەبەر چاو گرتووە کە لە غەزوەکاندا بە کۆیلەکردن هەبووە بەڵام ئەوەیان لەبەر چاو نەگرتووە کە زۆربەی ئازاد کردن بووە، وە ئەوەیان لەبەر چاو نەگرتووە کە ئامانجی شەریعەت ئازاد کردنە نەوەک بە کۆیلە کردن، وە ئەوەیان لەبەر چاو نەگرتووە کە پێغەمبەری خوا بە ناچاری مەحکوم بووە بە حاڵەتی دونیای ئەوکات لە لە هەموو دونیا ئەوە باو بووە کە دیل کراوە بەکۆیلە هەتا توانی وردە وردە کەمی کاتەوەو چارەسەری بکا.

**٨.** من دەزانم لەسەر ئەم وتانە تاوانبار دەکرێم بەڵام ئێمە لای خوا گوناهبار دەبین ئەگەر ئامانجی قورئان و پێغەمبەر و شەریعەت زاڵ نەکەین بە سەر بۆچوونی زانایاندا لە بابەتێکی ئەوا گرنگدا، ئێمە ناڵێین ئەوان هەڵە بوون، بەڵام ئەوان بۆ سەردەمی خۆیان ژیاون و ئێمەش بۆ سەردەمی خۆمان. بۆیە دووبارەی دەکەمەوە بەکۆیلە کردن لە جەنگەکاندا ئەوەندەی دەستکردی مەزهەبەکان بووە ئەوەندە ڕێنمای قورئان و سونەت نەبووە، وە ئەم بابەتە لە سونەت و سیرەت و مەقاسیدی شەریعەت دا زیاتر ڕوون دەکەینەوە ان شاء الله.

## ڕوونکردنەوەی
## ئایەتی ٢٤ ی سورەتی النساء

لەڕاستیدا مولحیدەکان زورترین گوومان کە درووستی دەکەن لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەڵێن ئیسلام حەڵاڵی کردووە لەشەڕدا ئافرەتانی خاوەن مێرد بکەیە کەنیزەک و بچیە لایان بەبێ ڕەچاو کردنی حاڵەتی دەروونی ئەوانەی کە مێردیان کوژراوە یان هەڵاتووە یان دەستگیر کراوە.

ئەمە دەقی ئایەتەکەیە کەدەفەرموێ: وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٢٤﴾ النساء

واتە: ژنی بەشووتان پێ ناشێ مەگەر ئەوانەی بوونەتەماڵی خۆتان. لە خوداوە ئەم بڕیارە و بۆ نووسراوە. جیا لەمە ڕێتان دراوە بە دراوی خۆتان ژن بێنن بەڵام بە پاکی بێ، نە بە داوێنپیسی. لە بەرانبەر ئەو لەزەتەی لە ژنەکانی دەبینن، ئەو ماڵەی خودا بۆیانی بڕیار داوە و کرای خۆیانە لەسەرتان، ئێوە بیدەن. ئەگەر لەپاش دیاریکردنی مارەیی، لە نێو خۆتاندا پێک هاتن، هیچ گوناهێکوو ناگاتێ و خودا زانای لەکارزانە.





## فەرمودەکان دەربارەی
## غەزوەی بەنی ئەوتاس



١. وَحَدَّثَنِيهِ يَحْيَى بْنُ حَبِيبٍ الْحَارِثِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدُ بْنُ الْحَارِثِ ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ ، عَنْ قَتَادَةَ ، عَنْ أَبِي الْخَلِيلِ، ١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ، قَالَ: أَصَابُوا سَبْيًا يَوْمَ أَوْطَاسَ لَهُنَّ أَزْوَاجٌ، فَتَخَوَّفُوا ؛ فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ : { وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ } . راوه مسلم ١٤٥٦

٢. حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ ، قَالَ : حَدَّثَنَا عُثْمَانُ الْبَتِّيُّ ، عَنْ أَبِي الْخَلِيلِ ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ٢،الْخُدْرِيِّ ، قَالَ : أَصَبْنَا سَبَايَا يَوْمَ أَوْطَاسٍ وَلَهُنَّ أَزْوَاجٌ فِي قَوْمِهِنَّ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَتْ : { وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ } . هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. وَهَكَذَا رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ، عَنْ عُثْمَانَ الْبَتِّيِّ، عَنْ أَبِي الْخَلِيلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. وَأَبُو الْخَلِيلِ اسْمُهُ : صَالِحُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ. وَرَوَى هَمَّامٌ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ قَتَادَةَ ، عَنْ صَالِحٍ أَبِي الْخَلِيلِ ، عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ الْهَاشِمِيِّ ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى الله عليهوسلم. رواه الترمذی. ١١٣٢

٣. حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ، قَالَ: أَخْبَرَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلَالٍ ، قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامُ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، عَنْ أَبِي الْخَلِيلِ، عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ الْهَاشِمِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أَوْطَاسٍ أَصَبْنَا نِسَاءً لَهُنَّ أَزْوَاجٌ فِي الْمُشْرِكِينَ، فَكَرِهَهُنَّ رِجَالٌ مِنَّا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: { وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ} . هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. حكم الحديث: صحيح. رواه الترمذی. ٣٠١٦

**٤.** حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ صَالِحٍ أَبِي الْخَلِيلِ، عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَابُوا سَبَايَا يَوْمَ أَوْطَاسٍ لَهُنَّ أَزْوَاجٌ مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ، فَكَانَ أُنَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَفُّوا وَتَأَثَّمُوا مِنْ غِشْيَانِهِنَّ، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي ذَلِكَ : { وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ}. حكم الحديث: حديث صحيح. رواەاحمد ١١٧٩٧

ئەو ئایەتە پیرۆزە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی تەواوە، کە بەداخەوە ئەم بابەتە هەستیارانە زۆر جار مافی خۆی پێنادرێ و دەبێتە بیانوو بەدەست مولحیدەکانەوە و مسوڵمانە ئیمان لاوازەکانیش دڕدۆنگ دەبن و گوومانیان بۆ درووست دەبێ، وە هەتا کەسی وا هەبووە لەسەر مانای ئەم ئایەتە هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام، بۆیە بە پشتیوانی خوا ئەم ئایەتە لە چەند خاڵێکدا ڕوون دەکەینەوە.

**١.** ئایا مانای ئایەتەکە چیە؟ وە ئایا ئەم ئایەتە تەنیا یەک واتای هەیە، وە ئایا ئەو (إلا)یە کە لەئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە واتای چیە؟

### ئایەتەکە دوو لێکدانەوەی بۆکراوە:

**یەکەم:** کە (استثناء) متصل بێ واتە دوای (إلا) جیا کرابێتەوە لە پێش(إلا) ئەوە مانای ئایەتەکە وایە کە ئەو ئافرەتانەی لە جەنگدا دەگیرێن و خاوەن هاوسەرن بۆتان حەڵاڵە بچنە لایان دوای تەواو بوونی عیدەیان، کە ئەمە جێگای ڕاجیایی نیە کە نابێ بە بێ تەواو بوونی عیدە بچنە لایان، ئەوکات لەسەر ئەم لێکدانەوە بۆ ئایەتەکە گوومانەکە درووست دەبێ، بەڵام ئەگەر بە لێکدانەوەی دووەم: بێ ئەوە ئایەتەکە هیچ گوومانێک هەڵناگرێ، واتە ئەوکات ئەگەر(إستثناء کە منقطع) بێ وەک ئیمامی ڕازی لەتەفسیرەکەی

ئەوە ترجیح دەدا و پەسەندی دەکا بۆ ئەوەی لەگەڵ تەواوی ئایەتەکانی تری قورئاندا یەک بگرێتەوە و ناکۆک نەبێ کە باس لەوە دەکرێ ژن بە بێ مارەیی مارە ناکرێ و ژنی خاوەن مێرد دروست نییە مارە بکرێ هەتا مێردەکەی جیا دەبێتەوە لێی یان وەفات دەکا، کەواتە ئەگەر (استثناء کە منقطع) بێ و بە واتای (لکن) بێ ئەوکات مانای ئایەتەکە ئەوای لێدێ: وە ئەوانەی کە لێتان قەدەغەن وەک ئەو ئافرەتانەی کە پێشتر ناویان هات، ئەوە ئافرەتی خاوەن مێردیش لە ئێوە (حەرامن) قەدەغەن بەڵام ئەگەر بوونە خاوەنی وان واتە بوونە خاوەنی ئافرەتانی پاک دامێن بە هۆی مارەکردن کە کەنیزەک بوون، یان زیاتر لەژنێک مارەکەن کە ئازاد بوون ئەوسا بۆتان درووستە، واتە ئایەتەکە بەروونی دیارە باسی ئافرەتی خاوەن مێرد ناکا.

**٢.** ئێمە ناڵێین باسی گیرانی ئافرەتانی خاوەن مێرد لە ئیسلامدا نییە و لە شەڕدا ئەوان نەگیراون بەڵام بە پێی ئەو واتای دووەمە کە ئیمامی ڕازی پەسەندی دەکا ئەوە باسی بەکۆیلە کردنی ئافرەتی خاوەن مێرد لە قورئانی پیرۆزدا باس و خواسێکی نییە، کە بەڕاستی ئەم بۆچوونەی ئیمامی رازی زیاتر لەگەڵ ڕوحی قورئاندا دێتەوە، چونکە قورئانی پیرۆز تەشریعی هەتا هەتایی خوای گەورەیە، وە لە قورئانی پیرۆزدا (استثنای منقطع) یەکجار زۆرە، وە لە زمانی عەرەبیشدا زۆر هاتووە و پێویستی بە بەڵگە نییە، کەواتە هیچ تەرجیحێک بۆ تەفسیری یەکەم بە سەر تەفسیری دووەمدا نیە بە پێی قورئانی پیرۆزو زمانی عەرەبی.

**٣.** ئەدی بۆچی زانایان زیاتر ڕای یەکەم و تەفسیری یەکەمیان پەسەند کردووە، ئەوە لەبەر کۆمەڵێک فەرموودە و ڕیوایەتی سیرەیە نەوەک قورئان و زمانی عەرەبی.



**٤.** چەند فەرموودەیەکمان هێناوە کە لەسەرچاوەکانی پشت پێ بەستراوی مسوڵمانانددا باس کراوە لەوانە لە سەحیحی موسلیم، سونەنی ترمزی، ابوداود و موسنەدی ئەحمەد دا هاتووە ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ، چەند سەرنجێک لەسەر فەرمودەکان.

فەرموودەکە ئاحادە و دەگەریتەوە سەر ئەبو خلیل ئەویش لە ئەبی سەعید ئەویش ڕووداوەکەی (ئەوتاس) باس دەکا، کە هاوەڵان بەسەر هاوبەش پەرستەکاندا سەرکەوتن، وە ئافرەتەکانیان بەدیل گرتن پێیان ناخۆش بوو بچنە لایان لەبەر ئەوەی خاوەنی مێرد بوون ئەو ئایەتە بەو هۆیەوە دابەزی .

ئەمە لێکدانەوەی ئەبو سەعیدە بۆ دابەزینی ئایەتەکە، دیارە ئەم فەرموودەیەش دراوەتە پاڵ ئەبی سعید، دیارە یەک کەس لەوی گێراوەتەوە کە ئەبو خلیلە، دیارە لە ڕیواتەکاندا جیاوازی هەیە هەندێکیان لە نێوان ئەبو خەلیل و ئەبی سعید عەلقەمەش باس دەکەن و زیادی دەکەن.

گرفتی ئەم فەرمووده لەڕووی واتاوە ئەوەیە کە باس لەوە دەکا کە ئەوانە موشریک بوون، دەی بە دەقی قورئان مارەکردن و چوونە لای هاوبەش پەرست دروست نیە :

وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُواْۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ البقرة

ژنانی هاوبەش پەیداکەر مارە مەکەن تابڕوا دەهێنن کەنیزەکێکی بڕوادار باشترە لەژنە (ئازادێکی) هاوبەش پەیداکەر با(هاوبەش



پەیداکەرەکە) سەرسامیشی کردبن وە ژنانی موسوڵمان مارە مەکەن لە هاوبەش پەیداکەران تابڕوا دەهێنن وە کۆیلەیەکی بڕوادار باشترە لە (ئازادێکی) هاوبەش پەیداکەر با سەرسامیشی کردبن (بە دارایی یا جوانیان) ئەوانە بانگ(ی خەڵک) دەکەن بۆ ناو ئاگر بەڵام خوا(خەڵک) بانگ دەکات بۆ بەهەشت و لێخۆش بوون بەفەرمانی خۆی وە نیشانەکانی خۆی ڕۆشن دەکاتەوە بۆ خەڵکی بەشکو بیر بکەنەوە .

وە دەبێ ئەو فەرموودەیە کە ناکۆکە لەگەڵ قورئانی پیرۆز دەبێ دژ بەیەکبونەکە لابدرێ چۆن؟ یان دەبێ بڵێین ئافرەتەکان مسوڵمان بوون، وەک ئیمامی نەوەوی لە شەرحی سەحیحی موسلیم وا دەفەرموێ، کە ئەمەش تۆزێک دوورە ئەم بریارە لەناکاوە ئەوا فەوری درا بێ، وەیان دەبێ بڵێین ئەو رووداوە پێش ئەوە بووە کە ئافرەتی هاوبەش پەرست قەدەغە کرابێ، لە راستیدا ئەم دەعوایەش بە بێ بەڵگەی ڕوون لە مێژووی هەردووک ئایەتەکە جێگای پرسیارە، یان دەبێ بڵێین ئەسڵەن مسوڵمانان بەلایان دا نەچوون لە ڕووی جووتبوونەوە، کە ئەمە موافقە لە گەڵ ئایەتەکانی تری قورئان کە چوونە لای هاوبەش پەرست درووست نییە، وە بەدڵنیاییش لەدوای مسوڵمان بوونی خەڵکی هەوازین و ئەوتاس هەموویان خێزانەکانیان بۆ گەڕێنرانەوە وەک زانایانی سیرە بۆمان باس دەکەن وە ئیبن تەیمیەش دەڵێ خێزانەکانیان بۆ گەڕاونەوە لە دوای ئەوەی کە مسوڵمان بوون.

**٥.** لە هەر شتێک کە ئیحتمال و ئەگەری تیکەوێ ناکرێ بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە (إذا ثبت الاحتمال بطل الاستدلال)، بەتایبەتیش کە پێچەوانەی قورئان بوو.

**٦.** ئەگەر دامان نا فەرموودەکەش کێشەی نەبوو، هەرچەندە لە رووی سەنەدەوە گرفتی هەیە چونکە ڕووداوێکی ئەوا گەورە کە هەزاران کەس ئامادەی بووە بۆچی تەنیا ئەبو سەعید دەیگێڕێتەوە!؟ وە لە ڕووی ماناوەش کێشەی هەیە چونکە ئافرەتی هاوبەش مارەکردن و چونە لای درووست نیە بە دەقی ئایەت، دەبێ ئەوە بزانین یاسای جەنگ حاڵەتی نائاساییە، لە جەنگدا یاساکان دەگۆڕێن و حاڵەتی نائاسایی ڕادەگەیەنرێ.

**٧.** لە ئیسلامدا ڕێگا نەدراوە کە ئافرەت بکوژرێ هەرچەند ئەگەر شەڕکەریش بێ ئەمەش ئەوپەری ڕەحمەتی ئیسلامە لەکاتێکدا هاوبەش پەرستانی مەککە سوومەیەی خێزانی یاسر بە چرقەی گەرما رمیان بە دامێندا کردوو شەهیدیان کرد لە کاتێکدا ئەوکات لەشەڕدا نەبوون.

**٨.** لەوکاتەدا کە ئافرەتان کراون بە کۆیلە یاسای هەموو دونیا هەر وا بووە بۆیە ئێمە دەبێ کات و حاڵەت و نەریتی کاتی ڕووداوەکە لەبەر چاو بگرین، بۆیە ئەم یاسایە ئیسلام دای نەهێناوە بەڵکو ڕێکی خستوە و لە دڕندەیەوە بە ئینسانی کردووە.

**٩.** هیچ تاوانێک نییە لە ئیسلامدا مرۆڤ لەسەری بکرێ بە کۆیلە بەڵام زۆر کەفارەت و تاوان هەن کە دەبێ بەندەی تێدا ئازاد بکرێ، وەک چەند نمونەیەکمان لەقورئان باس کرد وە زیاتریش باسی دەکەین.

**١٠.** ئەو ئافرەتەی کە لەشەڕ دەگیرێ ئەگەر لە سووڕی مانگانەدا بوو یان لە خوێنی منالبوندا بوو نابێ بچیە لای، وە ئەگەر حەملی هەبوو نابێ بچیە لای تا لە دووگیانی دەردەچێ.

**١١.** وە ئەگەر مێردی هەبوو نابێ بچیە لای هەتا دڵنیا نەبین کە رەحمی خاوێنەو منالی نییە، دەی باشە ئەگەر بابەتەکە بەس ئارەز و بازی و ڕابواردنە ئەی بۆچی ئەم ڕێگریانە هەن؟.

**١٢.** ئەگەر ئافرەتەکە لەگەڵ هاوسەرەکەی بەیەکەوە مسوڵمان بوون ئەوە نیکاحەکەیان بەردەوام دەبێ و هەڵناوەشێتەوە لەسەر ڕای بە هێز، چونکە ئەمە زیاتر لەگەڵ قورئاندا دێتەوە و دوورە لە دووژمنکاری لە نێوان ئەو هاوسەرە تازەیە و هاوسەرە کۆنەکەی کە مسوڵمان بووە، وە ئەگەر مێردەکە مسوڵمان بێ دیسان هەر خێزانی خۆیەتی تا مسوڵمان دەبێ یان لانی کەم تا لە عیدەدا بێ، وە ئەگەر ئافرەتەکە گیراوەکە مسوڵمان بوو وە مێردەکەی کوژرا بوو یان ڕای کردبوو ئەو جۆرەیان دەکرێ بە خێزان بە هەموو ئەو مەرجانەی کەباسمان کردن.

**١٣.** وە ئافرەتەکە کە گیرا دەتوانی بڵێ من بوومە پشکی کێ کتابەتی لەگەڵدا دەکەم و خۆم دەکڕمەوە، ئەوکات گەورەکەی دەبێ کتابەتی لەگەڵ دابکات و دەست بە جێ ئازاد دەبێ، وەک جووەیریەی کچی حارس لەگەڵ پێغەمبەردا کردی علیه الصلاة والسلام وەک لە بوخاریدا هاتووە، کە ببووە بەشی سابت ی کوری قەیس بەلام رازی نەبوو، بۆیە داوای لە پێغەمبەر کرد کە یارمەتی بدا خۆی بکڕێتەوە، وە پێغەمبەریش پێشنیارەکەی قەبوڵ کرد و وتی هاوکاریت دەکەم و وە ئەگەر دەتەوێ شوم پێ بکە، ئەویش ڕازی بوو بەو هۆیەوە ئافرەتانی بەنی موستەلەق هەموو ئازاد کران.

**١٤.** وە دەبێ دەوڵەت و گەورەی کۆیلەکە و دەوڵەمەندەکان هاوکاری بکەن خۆی بکڕێتەوە.

**١٥.** وە دەبێ بەشێک لە زەکاتیش بۆ خۆ کڕینەوەی بەندەکان دابنرێ.

**١٦.** ئەوە لەکاتێکدایە کە خراپترین حاڵەت ئەوەیە بکرێنە کۆیلە، بەڵام باشتر ئەوەیە ئازاد بکرێن یان بێ بەرامبەر، یان بە ماڵ، یان بە خۆ کرینەوە، یان لە بری کەفارەت و تاوانەکان، یان تەنیا لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە.



**١٧.** لەگەڵ ئەم هەموو ڕێگایانەی کە باسمان کرد بەڵام با خراپترین حاڵەت دابنێین کە ئافرەتەکە بوو بە کەنیزەک وە مێردی نەماوە، یان دەستی پێی ڕاناگا، باشە ئەو ئافرەتە جنسی نیە؟ نەفسی نیە؟ ئایا پێویستی بە یارمەتی و نەفەقە نیە؟ ئەگەر یەکێک ببێتە هاوسەری و ڕیزی لێبگرێ و مافەکانی دابین بکا باشتر نیە لەوەی بەسەر گەردانی و تەنیایی ژیان بەڕێکا؟ بێگوومان باشترە بەتایبەت لەو کاتەشدا دونیا ئەوا بووە، ئەوان توانیویانە لەگەڵ ئەم بارو دۆخە خۆیان بگونجێنن.

**١٨.** مولحیدەکان بۆیە ئەوە دەڵێن گوایە پەرۆشی ئەخلاقیانە! باشە ئەی بۆ باسی ئەم هەموو شتە جوانە ناکەن کە ئیسلام وەک یاسا بۆ کۆیلایەتی کردی؟ ئەی بۆ ڕەخنە لە و کەسانە ناگرن کە لە سەردەمی ئیسلامدا هیچی باشیان بۆ کۆیلە پێ نەبوو.

**١٩.** ئەگەر مولحیدەکان باسی ئەخلاق دەکەن ئەی بۆ هیچیان لەسەر شیوعیەتی روسیا و سیرب و چین و بۆرما نەگوت کە بە ملیونان هەتک و ناموس شکاندیان کرد بە مسوڵمانان لەوەڵاتەکانی خۆیان.

**٢٠.** لە گەڵ زیاد بوونی ئیلحاد لاقەکرنی ئافرەت لە زیاد بووندایە لە هەموو جیهاندا، بەدرەوشتی لە لوتکەدایە، بۆیە سەیرە مولحید بە نەزانی و بێ لەبەرچاو گرتنی زەمەنی هاتنی ئیسلام قسە لە سەر کۆیلە و بەکۆیلە کردنی ئینسان بکا لە ئیسلامداو ئیسلامی پێ تاوانبار کا.

**٢١.** علمانیەت و ئیلحاد کە دوانەی یەک رەحمن بە ئاشکرا دیارە کە چ بەد رەوشتی و بەکاڵا کردنی ئافرەتیان دەست پێکردوە لە جیهانی ئیسلامی بە گشتی و هەریمی کوردستان بەتایبەت، بۆیە بەراستی سەیرە مولحید باسی ڕەوشت و مەزلومیەتی ئافرەت بکا بەتایبەت مولحیدی کوردی!.



# ڕاڤەی دوو ئایەتی سورەتی ( الاحزاب)



دوو ئایەت هەیە لە سورەتی الاحزاب كە مولحیدەكان زۆر بە كاری دێنن و چەواشە كاری تێدا دەكەن، وە لە هەمان كاتدا بەشێكی بەرچاو لە مسوڵمانان بەرچاویان دەربارەیان ڕوون نییە بۆیە بە پێویستم زانی هەڵوەستەیەكی لەسەر بكەین:

دەقی ئایەتی یەكەم: يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّـٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَـٰلَـٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٠﴾ الأحزاب.

ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) ئێمە ئەو هاوسەرانەتمان بۆ حەڵاڵ كردوویت كە مارەییت پێ بەخشیون، ئەو ئافرەتانەش كە كەنیزەكی تۆن و لە جەنگدا بەدیل گیراون) لەو سەردەمەدا كەنیزەك دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی سروشتی بووە، ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەجۆرەها شێوە هەوڵی نەهێشتنی ئە دیاردەیە داوە)هەروەها كچە مامەكانت، كچە پوورەكانت، كچە خاڵەكانت، كچی ئەو پوورانەت كە كۆچیان كرد لە تەک تۆدا، وە هەر ئافرەتێكی بڕوادار كە ئەگەر ویستی خۆی پێشكەشی پێغەمبەر بكات، وە پێغەمبەریش ویستی مارەی بكات، كە ئەمەیان تایبەتی

تۆیە (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم) نەک ئیمانداران، ئێمە ڕێ و شوێنمان بۆ ئەوان (واتە ئیمانداران) ڕوونکردۆتەوە بەرانبەر هاوسەران و کەنیزەکانیان (ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەوەیە کە:) هیچ دڵتەنگی و غەمبارییەک ڕووت تێ نەکات (وابزانی کە تۆ لە سنوور دەرچوویت بەوەی کە لە چوار هاوسەر زیاترت هەیە) هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە (بۆ ئیمانداران).

**ڕێنمایەکانی ئەو ئایەتە پیرۆزە بۆ ئێمە لەوانە:**

**١.** خوای گەورە بەیانی ئەوەمان بۆ دەکا دەربارەی ئافرەتان ئایا کێی بۆ حەڵاڵە و کێی بۆ حەرامە وە مەرجەکانی حەڵاڵ بوونی ئافرەتان بۆ پێغەمبەر چین علیه الصلاة والسلام؟

**٢.** لەسورەتی(النساء) خوای گەورە بۆ ئیماندارانی بە ڕەوا دانا کە دەتوانن ژن بێنن دوو یان سێ یان چوار بەمەرجی دادگەری لە نێوانیاندا، وە ئەگەر نەیان توانی دادگەری بکەن با یەک ژن بخوازن ئەگەر توانیان، خۆ ئەگەر نەیان توانی با کەنیزەک مارە بکەن بە پێی پێویست چونکە لە حاڵەتی ئاسایی کە بتوانن مارەیی و نەفەقەی ئافرەتی ئازاد بدەن نابێ کەنیزەک مارە بکەن، وە ئەگەر پێویستیشیان بوو هەر نەیهێنن باشترە بۆ ئەوەی مناڵەکان بە کۆیلەیی لەدایک نەبن و زنجیرەی کۆیلایەتی بپچرێ، لەو ئایەتەی (سورەتی آلنساء) وا فەهم دەکرێ کە پێغەمبەریش بەم بڕیارە مشمول بێ و پابەند بێ، بەڵام لە (سورەتی الاحزاب) لەو ئایەتەی باسمان کرد پێغەمبەر خوا بۆی هەبووە ژن بێنێ زیاتر لە چوار چونکە پێغەمبەری خوا مەترسی جێ بەجێ نەکردنی دادگەری نەبووە، بەڵکو جەنابییان دادگەری بە مرۆڤایەتی ئاشنا کردەوە.



**٣.** ئەم ئایەتە پێمان دەڵێ کە کە نیزەک بۆ پێغەمبەر حەڵاڵە علیە الصلاة والسلام، بەتایبەت ئەوانەی کە دەکەونە ژێر دەستی لە جەنگەکان، لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەمە شەرعیەت دان بە کۆیلە کردن نییە و درێژکردنەوە نییە؟ ئێمەش دەڵێین هەڵە تێگەیشتن لە ئایەتە کە هەیە بۆ؟

• ئەگەر پێغەمبەر کەنیزەکی بۆ ڕەوا نەبا دەیان وت کەنیزەک هێندە بێ ئەرزش و نزم بووە ئەوەتا پێغەمبەر بۆی حەڵاڵ نەبووە، وە دەیان وت ئەگەر کەنیزەک حورمەتی هەبا پێغەمبەر دەیکردە خێزانی خۆی.

• وە پێغەمبەر کەنیزەکی نەبووە وەک دواتر باسی دەکەین.

• پێغەمبەر ئازاد کردنی کەنیزەکی داهێنا وەک ماریە و سەفییە و جوەیرییە هەر سێکیانی کەوتە بەردەست بەڵام هەرسێکیانی ئازاد کرد.

• کەنیزەکیش مرۆڤە چی تێدایە ئەگەر ببێتە خێزانی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام، بۆیە کەنیزەک ئەوەندە پەست و نزم نییە ڕێی نەکەوێ ببێتە دایکی ئیمانداران و خێزانی پێغەمبەری خوا کە گەورەترین مەخلوقە.

• وە پێغەمبەر ئەوەی بۆی حەڵاڵ بووە مەرج نییە ئەنجامی دابێ، ئەوەتا کەنیزەکەی بۆ حەڵاڵ بووە و نەیبووە، چونکە نەبوونی ئەولاتر بووە و زیاتر لەگەڵ ئامانجی شەریعەت دێتەوە.

• پێغەمبەر کەنیزەکی نەبووە لەگەڵ ئەوەشدا بەداخەوە بەشێکی زۆر لە زانایان و مسوڵمانان پێ یان وایە بوونی کە نیزەک قەتعیاتی دینە و ناکرێ دەست بەرداری بین، وە ئەگەر کەسێک ئینکاری بوونی بکا، یان بڵێ بوونی باش نییە پێیان وایە تاوانێکی گەورەیی ئەنجام داوە و خۆی دۆڕاندوە.

٤. پێغەمبەری خوا لە بەشکردنی شەوانەی لە مانەوە لەلای خێزانەکانی ئازاد بووە بەڵام ئەم ئازادیەی بەکار نەهێناوە چونکە ئەمە ئەولاتر بووە بۆ ئەو کە دادگەری جێ بەجێ بکا، هەرچەند ئەوەی خوای گەورە بەڕەوای دابنێ گوومان لە باش بوونیدا نیە.

٥. وە ئەو ئایەتە پێمان دەفەرموێ هەرچەند پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام بۆی هەبووە لە چوار ژن زیاتری هەبێ بەڵام ئەم ئایەتە پیرۆزە پابەندی دەکا بەوەی کە بەو مەرجە کچە مام و کچە خاڵ و کچە پوری بە هەردوو لاوە بۆ ڕەوایە کە دەبێ کۆچەر بن، بۆیە پێغەمبەر حەزی کرد(ئوم هانیئ) بێنێ کە ئامۆزای بوو خوشکی عەلی بوو بەڵام لەبەر ئەوەی کۆچەر نەبوو نەیتوانی بیهێنێ.

٦. ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان پێشکەشی پێغەمبەر دەکەن بێ مارەیی ئەوانەش بۆ تەشریفیان ڕەوا بووە کەمارەیان کا، بەڵام دیسان ئەو مافەشی بەکار نەهێناوە، چونکە ئەگەر بێت و مارەیی بدات بۆ خێزانی تر ئەرکی گرانتر دەبێ، بۆیە پێغەمەری خوا هیچ ئافرەتێکی لەو جۆرە لانەبووە کە خۆی پێشکەش کردبێ.

٧. مانایی دووەمی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە مەبەست لەم ئافرەتانەیە کە بەشوودانیان دەدەنە دەست پێغەمبەر بە تایبەت ئەوانەی وەلی ئەمریان نییە، یان وەلی ئەمریان هەبووە ڕازییە کە پێغەمبەر بە شویاندا بۆ هەرکەسێک کە جەنابیان پێی باش بێ، لەسەر مانای یەکەم دروست نییە هیچ ئافرەتێک خۆی پێشکەشی پیاوێک کا بێ مارەیی.

٨. لە ئایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا دەرگای ئەوەی لەسەر داخراوە کە خێزانی تر بێنێ، ئەمەش وەک پاداشتێک بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام وابووە چونکە بەژیانی هەژاری و نەداری و کۆچەری

و غەریبی لەخزمەت پێغەمبەردا هەڵیان کردووە و سەبریان گرتووە، دەقی ئایەتەکە ئەمەیە کەدەفەرمویٚ : لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾ الأحزاب

واتە: لەمەودوا هێنانی ئافرەتانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نییە، یان واز هێنان لە هەندێکیان، تا هاوسەرانی تر بخەیتە جێیان، هەرچەندە ئەو ئافرەتانەی دەتەویٚ بیانخیتە جێگەی هاوسەرانت سەرسام بیت لە ڕێک و پێکییان جگە کەنیزەک، هەمیشە و بەردەوام خوا چاودێری هەموو شتێک دەکات.

٩. کەواتە کەنیزەکی بۆ حەڵال بووە بەڵام نەیهێناوە وەک وتمان چونکە نەهێنانی باشتر بووە بۆ ئەوکات و بۆ دواتر وە خوای گەورەش دەفەرمویٚ (وأن تصبروا خير لكم) ئەگەر سەبرتان هەبیٚ کەنیزەک نەهێنن باشترە، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان سەبری گرت و کەنیزەکی تری نەهێنا.

١٠. ئەوەشمان لە بیر نەچیٚ کە ژن هێنانی پێغەمبەری خوا ئامانج دار بووە و ئەوپەری دڵنەوایی و میهرەبانی تێدا ڕەچاو کراوە.

١١. خوای گەورەش بە ئێمە دەفەرمویٚ شوێن پێغەمبەر کەون و گویٚ ڕایەڵی بکەن دەیبا ئێمەش وەک ئەو بکەین. قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾ ال عمران

واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵیٚ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەویٚت کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆش بویٚت وە لە گوناهەکانتان خۆش ببیٚت وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە.

**١٢.** بۆیە لە ڕاستیدا حەق وایە ئەم دوو ئایەتە لەسورەتی(الاحزاب) بکەینە بەڵگەی بە کۆیلە نەکردن نەوەک بە پێچەوانەوە، چونکە گومان لەوەدا نییە پێغەمبەری خوا لە هەمووومان باشتر لە قورئانی پیرۆز تێگەیشتەوە و جێ بەجێی کردووە.

# بەشی شەشەم

# ئازادی کۆیلە لە سونەتی پێغەمبەری ئازیزدا

علیه أفضل الصلوات وأزكى التسليمات وأجمل التبريكات






## ئازادی کۆیلە لە سونەتی پێغەمبەری ئازیزدا

### علیه أفضل الصلوات وأزکی التسلیمات وأجمل التبریکات

لە سونەتی پێغەمبەری ئازیزیدا پانتایەکی فراوان دەبینین لە سەرچاوەکانی سونەت کە بابی تایبەتیان داناوە بەناوی(کتاب العتق) دەیان فەرمودەیان تێدا کۆ کردۆتەوە بە ناو نیشانی جیاواز ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی ئەسڵ لە ئیسلامدا ئازادی مرۆڤە، کۆیلایەتی مرۆڤە ستەمکارەکان دایان هێناوە نەوەک بەرنامە خواییەکان، وە ئێمە لە سونەت دا ناو نیشانێکمان نییە بە ناوی بە کۆیلە کردن ئەمە ڕوونترین بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستیەی کە باسمان کرد کە ئەسڵ ئازادی مرۆڤە نەوەک کۆیلایەتی با بچینە خزمەت فەرمودەکان هەندێکیان لێ بخوازین بە سەحیحی ئیمامی گەورەی حەدیس ئەمیری ئیمانداران لە حەدیس دەست پێدەکەین کە ئیمامی بوخارییە، ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێ بێ هەمووومان قەرزاری ئەو پیاوە و هاو وێنەکانی ئەو پیاوەین لەم بوارەدا کەسیش ناڵێ ئەمانە پارێزراون لە هەڵەو کەم و کوری .

١. أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا اسْتَنْقَذَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنْهُ مِنَ النَّارِ «. قَالَ سَعِيدُ ابْنُ مَرْجَانَةَ : فَانْطَلَقْتُ إِلَى عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، فَعَمَدَ عَلِيُّ بْنُ حُسَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا إِلَى عَبْدٍ لَهُ قَدْ أَعْطَاهُ بِهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ عَشَرَةَ آلَافِ دِرْهَمٍ، أَوْ أَلْفَ دِينَارٍ، فَأَعْتَقَهُ.. ٢٥١٧ رواه البخاری

پێغەمبەری خوا دەفەموێ: هەرکەسێ مرۆڤێکی مسوڵمان لە کۆیلایەتی ئازاد بکا ئەوە خوای گەورە بەهەر ئەندامێکی ئازاد کراوەکە، ئەندامێکی ئازاد کارەکە ڕزگار دەکا لە ئاگر، سەعیدی کوڕی مەرجانە دەڵێ کاتێک ئەو فەرمودەیەم بیست لە ئەبو هورەیرە چوم بۆ لای عەلی کوری حوسەینی کوری ئیمامی عەلی کە فەرمودەکەم بۆ باس کرد بەندەکەی ئازاد کردبوو کە ١٠ هەزار دیناری پێدا بوو مەبەست لە(دینار) میسقاڵی زێرە کە قیمەتەکەی بایی دە هەزار درهەمی زیو بووە، مەبەست ئەوەیە کە زۆر گرانبەها بووە ئازادی کرد، کە کاتی خۆی عبدالله ی کوری جەعفەر پێیدابوو رەزای خوا لەهەموویان بێ.

٢.کام بەندە خێرترە کە ئازادی بکەی؟ ئەوکەسەی کە خاوەنی زۆرترین نرخە لای خاوەنەکەی، چونکە خاوەنەکەی دەستی لەبەر نابێتەوە، عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ : سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ ؟ قَالَ : « إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ ». قُلْتُ : فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ ؟ قَالَ : « أَغْلَاهَا ثَمَنًا، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا»٢٥١٨ رواه البخاري

لە ئەبو زەڕەوە رەزای خوای لێبێ وتی پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام ئایا چ کردەوەیەک باشترینە؟ فەرموی: بڕوا بوون بە خوا، وە تێکۆشان لە پێناوی خوادا، وتم ئەی کام بەندە خێرترە بۆ ئازاد کردن؟ فەرمووی: ئەوەیان کە نرخەکەی زۆرترینە، وە لەلای خاوەنەکەی خاوەن قەدرترە،

دیارە ئەگەر بتوانین ئەوانە ڕزگار بکەین، ئەوانەی کە پارەیان کەمترە ئاسانترە و زوتر ئازاد دەبن.



٣.ئازاد کردنی بەندە لە کاتی ڕۆژ گیران و مانگ گیران و بەڵاو کارەسات، عنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ : أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ. ٢٥١٩ رواه البخاری

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر دەفەرموێ ڕەزای خوا لە خۆیی و باوکی بێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دەکرد لەکاتی ڕۆژگیراندا کۆیلە ئازاد بکەین، ئەوە مانای ئەوەیە گەورەترین خێر کە بەڵاو نەهامەتی لادەبا بەندە ئازاد کردنە.

٤. ئەگەر بەندەیەک هاوبەش بێ لە نێوان دوو کەسدا یەکیان ئازادی کرد، ئەگەر دەوڵەمەند و دەستکراوە بوو ئەوە نیوەکەی تریشی لەسەر حیساب دەکرێ و دەبێ نیوەکەی تریشی ئازاد بکا، " مَنْ أَعْتَقَ عَبْدًا بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَإِنْ كَانَ مُوسِرًا قُوِّمَ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُعْتَقُ «.٢٥٢١ رواه البخاری

٥. ئەو فەرمودەیەش هەمان مانای پێشووتری هەیە بەڵام بە کەمێک جیاوازی، مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ، قُوِّمَ الْعَبْدُ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ، وَإِلَّا فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ «.٢٥٢٢ رواه البخاری

ئەم فەرمودەیە باس لەوە دەکا ئەگەر چەند کەسێک هاوبەش بوون لە بەنەیەکدا یەکیان بەشی خۆی ئازاد کرد ئەگەر دەوڵەمەند بوو بەشەکانی تریشی لەسەر دەخەملێنرێ و دەبێ ئازادیان بکا، ئەوە ئەگەر هەیبوو دەوڵەمەند بوو، دەنا ئەگەر نەیتوانی ئەوە بەشەکەی ئەو ڕزگاری دەبێ، بەندەکە دەتوانێ لەم بەشە ئازاد کراوە کار بۆ خۆی بکا نەوەک بۆ خاوەنەکانی.



٦. ئەگەر بەندەکە بەشێکی ڕزگار بوو خۆی هەوڵ دەدا بۆ ڕزگاری بوونی لەبەشی ئەوانی تریش نابێ لەسەری قورس بکرێ(غير مشقوق عليه) واتە لەسەری قورس نەکرێ بەڵکو دەبێ هاوکاری بکرێ، عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : « مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا، أَوْ شَقِيصًا فِي مَمْلُوكٍ، فَخَلَاصُهُ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، وَإِلَّا قُوِّمَ عَلَيْهِ فَاسْتُسْعِيَ بِهِ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ «.٢٥٢٦. رواه البخاری

٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّهُ لَمَّا أَقْبَلَ يُرِيدُ الْإِسْلَامَ وَمَعَهُ غُلَامُهُ، ضَلَّ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِنْ صَاحِبِهِ، فَأَقْبَلَ بَعْدَ ذَلِكَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، هَذَا غُلَامُكَ قَدْ أَتَاكَ «. فَقَالَ : أَمَا إِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّهُ حُرٌّ. ٢٥٣٠ رواه البخاری .

ئەبو هورەیرە لەکاتێک دا هاتووە بۆلای پێغەمبەری خوا کە مسوڵمان بێ، لەخزمەت پێغەمبەردا بوو کاتێک بەندەکەی هاتەوە کە لەیەکتر بزر ببوون، پێغەمبەری خوا فەرموی ئەبو هورەیرە ئەوە خزمەتکارەکە هاتەوە، ئەبو هورەیرە وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئازادم کرد لە لەبەر خوا، لێرەدا دەبینین ئەبو هورەیرە تازە مسوڵمان بووە دەیەوێ دڵی پێغەمبەر خۆش کا لە یەکەم کاتەوە، زانی باشترین کار بەلای پێغەمبەرەوە عليه الصلاة والسلام بەندە ئازاد کردنە بۆیە ئەو کارەی ئەنجامدا.

٨. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتِ : اشْتَرَيْتُ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطَ أَهْلُهَا وَلَاءَهَا ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ : « أَعْتِقِيهَا ؛ فَإِنَّ الْوَلَاءَ لِمَنْ أَعْطَى الْوَرِقَ «. فَأَعْتَقْتُهَا، فَدَعَاهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَيَّرَهَا مِنْ زَوْجِهَا، فَقَالَتْ: لَوْ أَعْطَانِي كَذَا وَكَذَا مَا ثَبَتُّ عِنْدَهُ. فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا.٢٥٣٦ رواه البخاری .

دایکمان عائشە دەفەرموێ: بەندەیەکم ئازاد کرد بەناوی(بەریرە) کەس و کارەکەی ویسیتیان گەورایەتیەکەی بۆ وان بێ، مەبەست لە (ولاء) ئەوەیە هەر کات مرد ئەوان خاوەنی بن و میراتی بگرن، ئەمەم بۆ پێغەمبەری خوا باس کرد فەرموی (ولاء) بۆ ئەو کەسەیە پارە بداو ئازادی بکا، بڕۆ ئازادی بکە، دوای ئەوەی کە ئازاد بوو پێغەمبەری خوا ئازادی کرد ئایا لای مێردە بەندەکەی دەمێنێتەوە کەناوی (موغیس) بوو یان لێی جیا دەبێتەوە، ئەویش ئەوەی هەڵبژارد کە لای مێردە کۆیلەکەی نامێنێتەوە، بەریرە وتی ئەگەر مێردەکەم ئەوەندە و ئەوەندەشم بداتێ ( مەبەستی پارەی زۆر بو) لای نامێنمەوە، بۆیە خۆی ئازاد کرد لە مێردەکەی.

لێرەدا دەبینین ئازاد کردنی بەندە لە ماڵی پێغەمبەرەوە دەست پێدەکا، خۆی جووەیریە و سەفییە و ماریەی ئازاد کرد، ئێستاش عائیشەی خێزانی بڕیاری داوە (بەریرە) ئازاد بکا پارەیەکی زۆری لێ داوا دەکەن، بەڵام پێغەمبەر هانی دەدا ناڵێ پارەکە هی کێ یە، یان لە کوێی دێنی،

• یاسایەکی تریش گۆڕا ئەویش ئەوەیە گەورایەتی بۆ ئەو کەسەیە کە پارە دەدا بۆ ئازاد کردن نەوەک بۆ فرۆشیار.

• یاسایەکی تر ئەوەیە کە بەندەکە لە دوای ئازاد بوون تەواوی ئازادی پێدەدرێ، هەتا دەتوانێ لای مێردە کۆیلەکەشی نەمێنێتەوە.

٩. أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَعْتَقَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، فَلَمَّا أَسْلَمَ حَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، وَأَعْتَقَ مِائَةَ رَقَبَةٍ. قَالَ : فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا - يَعْنِي أَتَبَرَّرُ بِهَا - قَالَ : فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ لَكَ مِنْ خَيْرٍ ».٢٥٣٨ رواه البخاری

حەکیمی کوری حیزام لەسەردەمی نەفامی سەد کۆیلەی ئازد کردووە و باری سەد وشتری خێر کردووە، وە دووای مسوڵمان بونیش هەمان کاری کرد، پرساری کرد وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەو چاکانەی لەسەردەمی نەفامیدا کردوومە هیچم بۆ حیسابە بۆ سەردەمی ئیسلامەتی؟ پێغەمبەریش فەرموی: هەمووی ئەو چاکانەی پێشتر کردوتن بۆت حیسابن، بزانە ئەمە چ هاندانێکی گەورەیە بۆ ئازاد کردنی کۆیلە، وە بزانە حەکیم زانیویەتی کە ئازاد کردنی کۆیلە لەسەردەمی ئیسلامیدا چ خێرێکە و لەسەر دەمی نەفامیشدا چ پیاوەتی و گەورایەتیەکە بۆیە بەم زۆرییە ئەم کارە گەورەی ئەنجامدا.

١٠. {ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَمْلُوكًا لَا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ وَمَنْ رَزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنْفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا هَلْ يَسْتَوُونَ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ}. ئەمەیان ئایەتە فەرموودە نیە بەڵام ئیمامی بوخاری هێناویەتی بەراستی جوان و موناسبە، بەراستی کۆیلەی هەژار سەر لێ شێواوە، باشە کۆیلەیەک چەند خاوەنی هەبێ چۆن فریایان دەکەوێ، چۆن هەمویان لە خۆی رازی بکا؟! باشە ئەگەر فەرمانی گەورەکان دژی یەک بوون چۆن بیانسازێنێ بەیەکەوە! بۆیە بەڕاستی کۆیلایەتی گاڵتە جاڕییە بە مرۆڤ، جا لەوە کارەسات تر هەیە مرۆڤ بڕیاری خۆی بەدەست خۆی نەبێ، واللە مسوڵمانان عەیب و عارو حەیفە بەرگری لەکۆیلایەتی بکەن و بەچاکی بزانن، باشە چ دەڵێن لەبەرامبەر ئەم هە موو ئایەت و فەرموودە؟.

١١. ذَكَرَ عُرْوَةُ أَنَّ مَرْوَانَ ، وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَاهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ، فَقَالَ « إِنَّ مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَأَحَبُّ الْحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِحْدَى

الطَّائِفَتَيْنِ ؛ إِمَّا الْمَالَ وَإِمَّا السَّبْيَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِهِمْ «. وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْتَظَرَهُمْ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلَّا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ قَالُوا : فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا. فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ : « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ جَاءُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذَلِكَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ «. فَقَالَ النَّاسُ : طَيَّبْنَا ذَلِكَ. قَالَ: « إِنَّا لَا نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ «. فَرَجَعَ النَّاسُ فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا. فَهَذَا الَّذِي بَلَغَنَا عَنْ سَبْيِ هَوَازِنَ. وَقَالَ أَنَسٌ : قَالَ عَبَّاسٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : فَادَيْتُ نَفْسِي وَفَادَيْتُ عَقِيلًا.٢٥٤٠ رواه البخاري.

پوختەی ئەم فەرمودەیە ئەمەیە، کە لە دووای ئەوەی پێغەمبەری خوا لە تائیف بەسەر هۆزی هەوازیندا زاڵ بوو ماڵ و منداڵیان کەوتە دەستی مسوڵمانان، بۆیە داوایان لە پێغەمبەری خوا کرد کە خێزان و منداڵەکانیان پێبدەنەوە، پێغەمبەر خوا وتی هەڵی بژێرن یان ماڵ و سامانتان، یان خێزان و منداڵەکانتان، ئەوانیش کەزانیان پێغەمبەر سورە لەسەر ئەوەی کە یەکێک لەو دوانەیان بداتەوە، وتیان خێزان و منداڵەکانمان بۆ بگێڕنەوە، ئەوجار پێغەمبەری خوا چوو بۆ لای هاوەڵەکانی و وتاری بۆ خوێندنەوەو پێی وتن براکانتان لە هەوازین هاتوون مسوڵمان بوون و تەوبەیان کردووە، من پێم خۆشە خێزان و منداڵەکانیان بۆ بگێڕینەوە، جا کێ لە دڵەوە حەز دەکا بائەوە بکا، هەر کەسیش حەز دەکا دەست بە بەشی خۆیەوە بگرێ ئازادە، وە من



خێزان و منداڵەکانیان بۆ دەگێڕمەوە جا ئەوەی بێ بەرامبەر نایکا من لەیەکەم داهات کە دەستمان دەکەوێ پارەکەی پێدەدەمەوە، هەموویان وتیان لەدڵمانەوە بۆیان دەگێڕینەوە، پێغەمبەری خوا فەرموی چەند کەسێک دیاری بکەن بە گەورە و نوێنەری خۆتان ئێستا نازانم کێ ڕازییە و کێ ڕازی نییە بۆیە لە ڕێی نوێنەرەکانیانەوە هەموویان ڕازی بوون و خیزان و منداڵەکانیان ئازاد کرد، پێغەمبەری خوا زۆر هانی دان بۆ ئازاد کردنی گیراوەکان، دواتر فەرمووی ئەوانە براتانن هاتوون تەوبەیان کردووە وەک سەرنج ڕاکێشانیان بۆ ئازاد کردن، لەپاشان زیاتر لە دە ڕۆژ هەوڵی لەگەڵ دان بابەتەکەی دوا خست بۆ ئەوەی ڕازیان بکات، لەپاشان کە زانیان پێغەمبەری خوا زۆری پێخۆشە ئەوان هەموو ئازادیان کردن، لەپاشان بۆ دڵنیا بوون لە بڕیارەکە وتی با نوێنەر و گەورەکانتان بێن قسەیان لەگەڵ دەکەم بۆ ئەوەی مەجالی پەشیمان بوونەوەیان نەبێ، لەپاشان فەرمووی من ئازادیان دەکەم بەڵام لە نزیکترین کاتدا ئەوەی ڕازی نییە بە بەلاش ئازادی بکا من پارەکەی بۆ دەگێڕمەوە.

١٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « مَنْ كَانَتْ لَهُ جَارِيَةٌ فَعَالَهَا فَأَحْسَنَ إِلَيْهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، كَانَ لَهُ أَجْرَانِ «.٢٥٤٤ رواه البخاری.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ علیه الصلاة والسلام کەسێک کەنیزەکێکی هەبێ جوان بە خێوی بکا و لەگەڵیدا چاک بێ، لە پاشان ئازادی کاو مارەیی بکا ئەوە دوو جار خێری دەگاتێ.

بەراستی ئەمە هاندانێکی گەورەیە، یەکەم بەچاکە لەگەڵدا کردن، دووەم بە ئازاد کردن، سێ یەم بە مارە کردن.

**١٣.** سَمِعْتُ الْمَعْرُورَ بْنَ سُوَيْدٍ ، قَالَ : رَأَيْتُ أَبَا ذَرٍّ الْغِفَارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ، وَعَلَى غُلَامِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ : إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلًا فَشَكَانِي إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟ « ثُمَّ قَالَ : « إِنَّ إِخْوَانَكُمْ خَوَلُكُمْ ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَأَعِينُوهُمْ «.٢٥٤٥ رواه البخاری .

ئەبو زەڕی غەفاری کۆیلەیەکی هەبووە بۆ خۆی پۆشاکێکی زۆر جوانی لەبەردا بوو، هەمان پۆشاکیشی لەبەر ئەو کردبوو، دەربارەی ئەوە پرسیاری لێکرا هۆکاری ئەوە چییە کە وا کۆیلەکەت پۆشتە کردووە؟ ئەویش وتی ڕۆژێک لەگەڵی بوو بە شەرە قسەمان من بەهۆی دایکیەوە توانجم تێگرت، لە ریوایەتی تر ڕوونکراوەتەوە کە پێی وتووە کوڕی ژنە ڕەشەکە، لە پاشان پێغەمبەری خوا بە ناڕازی بوونەوە وتی ئایا بە هۆی دایکیەوە عەیبدارت کرد؟! لەپاشان فەرمووی براکانتان (نەیفەرموو کۆیلەکانتان) کارو باری ئێوە ڕێک دەخەن و هاوکاریتان دەکەن، ئەوان لە ژێر دەسەڵاتی ئێوە دان، هەرکەس براکەی لە ژێر دەستی دابوو لەچی دەخۆن لەوە دەرخواردیان دەن، چی دەپۆشن لەوە پۆشتەیان بکەن، کارێکیان پێ مەسپێرن کە لە توانایاندا نەبێ، وە ئەگەر پێتان سپاردن هاوکاریان بن.

**١٤.** الْعَبْدُ إِذَا نَصَحَ سَيِّدَهُ وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ «.٢٥٤٦ رواه البخاری

واتە ئەگەر بەندە دڵسۆزی گەورەکەی بوو، وە بە جوانی بەندایەتی پەروەردگاری خۆی کرد، ئەوە دوو جار خێری دەگا.

ئەمە شەرعی دان بە کۆیلە کردن نییە بە قەدەر ئەوەی کە هەوڵ دانە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی گەورە و بەندە، کاتێک گەورەکە مافەکانی ئەو جێ بەجێ دەکا با ئەویش دڵسۆزی بێ، بۆ ئەوەی گەورەکەی چاکەی زیاتری لەگەڵ بکاو مافی بپارێزێ، وەک ئەوە وایە کاتێک تۆ لە شوێنێک کارمەندی هەتا دڵسۆزتر بی و کارەکەت باشتر بکەی خاوەن کار زیاتر متمانەت پێدەکا.

١٥. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « أَيُّمَا رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ جَارِيَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَأَعْتَقَهَا، وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا عَبْدٍ أَدَّى حَقَّ اللَّهِ، وَحَقَّ مَوَالِيهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ «.٢٥٤٧ روه البخاری.

**لێرەدا هاندانی بۆ هەردوولا تێدایە:**

- گەورەکان بۆ ئەوەی بەندەکان و کەنیزەکەکان مارە کەن و پەروەردەیان بکەن.
- کۆیلەکان لەگەڵ گەورەکان پەیوەندیان باش بێ.

١٦. لَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ : أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ، وَلْيَقُلْ : سَيِّدِي، مَوْلَايَ، وَلَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ : عَبْدِي، أَمَتِي، وَلْيَقُلْ : فَتَايَ وَفَتَاتِي وَغُلَامِي ٢٥٥٢ رواه البخاری.

لەم فەرموودەیە ڕێگا نەدراوە بە گەورەکان بوترێ ڕەب، بەڵکو دەبێ بوترێ گەورە سەید، وە گەورەکانیش نابێ بڵێن بەندەکەم، یان کەنیزەکەکەم بەڵکو دەبێ بڵێ گەنجەکەم یان ڕۆڵەکەم، واتە وتەی شیرین و سەرنج ڕاکێش و جوان بۆ ئەوەی هەست بە ناتەواوی و بێ ڕێزی نەکەن.

واته لەدیندا تەنانەت وشەی بەندەکەم کەنیزەکەکەم ڕێگا نەدراوه. خۆزگە لە مەقاسیدی ئەم فەرمووده شیرنانه تێدەگەیشتین.

١٧. كُلُّكُمْ رَاعٍ فَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالْأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ٢٥٥٤ رواه البخاری».

به پێی ئەم فەرمودەش بەندەش بەر پرسیاریەتی هەیە لە ماڵی گەورەکەی .

١٨. إِذَا زَنَتِ الْأَمَةُ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِذَا زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِذَا زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا « فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: « بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ «.٢٥٥٦ رواه البخاری .

ئافرەتانی ژێر دەست و کەنیزەک لەسزادانا سزایان کەمتره، ئەم فەرموودەیە دەڵێ ئەگەر کەنیزەکەکەتان زینای کرد جەلدەی لێبدەن دیاره جەڵدەی ئەو پەنجا داره، ئەگەر دووبارەی کردەوە جەلدەی لێدەن دووباره، وە ئەگەر دووبارەی کردەوه بیفرۆشن ئەگەر به ڕیسێکیش بێ یان به کەزیەکیش بێ، مانای ئەوەیە ئەوان نابێ لە دووباره کردنەوەی تاواندا سزای قورس بدرێن.

١٩. إِذَا أَتَى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ - أَوْ : أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ - فَإِنَّهُ وَلِيَ عِلَاجَهُ «.٢٥٥٧ رواه البخاری.

ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: ئەگەر یەکێک لە ئێوه خزمەت کارەکەی شتێکی بۆ هێنا لە خۆراک با لەگەڵ خۆی بەشداری پێ بکا، یان پارویەک دوو پاروی هەر بداتێ. لە فەرموودەکەی تر فەرموێ: بۆ



خۆت چت خوارد ئەوەش بدەن بەوان، یان لانی کەم بەشیان بدەن، ئەم فەرموودەیە، ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە پێغەمبەری ئازیز بەوردی چۆتە ناو مافی بەندەو کەنیزەکەکان.

٢٠.ئەم فەرموودەیە باس لە پێویست بوونی وەڵام دانەوەی گەورەکان دەکا بۆ داوای مامەڵەی خۆ ئازاد کردن کە پێی دەڵێن (المکاتبة)، وَقَالَ رَوْحٌ ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ : قُلْتُ لِعَطَاءٍ : أَوَاجِبٌ عَلَيَّ إِذَا عَلِمْتُ لَهُ مَالًا أَنْ أُكَاتِبَهُ؟ قَالَ : مَا أُرَاهُ إِلَّا وَاجِبًا. وَقَالَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ : قُلْتُ لِعَطَاءٍ : تَأْثُرُهُ عَنْ أَحَدٍ ؟ قَالَ : لَا. ثُمَّ أَخْبَرَنِي أَنَّ مُوسَى بْنَ أَنَسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ سِيرِينَ سَأَلَ أَنَسًا الْمُكَاتَبَةَ، وَكَانَ كَثِيرَ الْمَالِ، فَأَبَى، فَانْطَلَقَ إِلَى عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ : كَاتِبْهُ. فَأَبَى، فَضَرَبَهُ بِالدِّرَّةِ، وَيَتْلُو عُمَرُ : { فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا } فَكَاتَبَهُ.

ئیبن جورەیج دەڵێ بە عەتام وت: ئەگەر بەندەکەم داوای ئازادی لێکردم وە ماڵی هەبوو ئایا پێویستە من بە دەمیەوە بچم؟ وتی وا دەزانم کە پێویست بێ واتە واجبە وەڵامی دەیەوە، عەمری کوڕی دینار دەڵێ بە عەتام وت لە کەست بیستوە یان زانیوە لە زانایانی پێش خۆت کە بەواجبیان دانابێ؟، وتی نا، بەڵام موسای کوڕی ئەنەس هەواڵی پێدام کە سیرین کە بەندەی ئەنەس ی خزمەت کاری پێغەمبەر بوو داوای لە ئەنەس کرد بە پارە ئازادی کا واتە مکاتبەی لە گەڵدا بکە، وە ماڵیشی زۆر هەبوو، بەڵام ئەنەس ڕازی نەبوو سیرین ئازاد بکا بە موکاتەبە، ئەویش لەلای عومەر سکاڵای لێکرد، عومەریش فەرمانی بەئەنەس کرد کە مامەڵەی ئازاد کردنەکە بکا بەڵام ئەنەس ڕازی نەبوو، عومەر بەدار لە ئەنەسی دا، دواتر عومەر ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، ئەوجار ئەنەس موکاتەبەی لەگەڵ سیریندا کرد، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە موکاتەبە واجبە، دەنا چۆن عومەر لەسەر شتی سونەت لە ئەنەس دەدا

لەکاتێکدا ئەنەس سەحابەی گەورەی پێغەمبەری خوایەو خزمەت کاری پێغەمبەری خوایە.

**٢١.** أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ بَرِيرَةَ جَاءَتْ تَسْتَعِينُهَا فِي كِتَابَتِهَا ، وَلَمْ تَكُنْ قَضَتْ مِنْ كِتَابَتِهَا شَيْئًا، قَالَتْ لَهَا عَائِشَةُ : ارْجِعِي إِلَى أَهْلِكِ، فَإِنْ أَحَبُّوا أَنْ أَقْضِيَ عَنْكِ كِتَابَتَكِ، وَيَكُونَ وَلَاؤُكِ لِي، فَعَلْتُ. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ بَرِيرَةُ لِأَهْلِهَا، فَأَبَوْا وَقَالُوا : إِنْ شَاءَتْ أَنْ تَحْتَسِبَ عَلَيْكِ فَلْتَفْعَلْ، وَيَكُونَ وَلَاؤُكِ لَنَا. فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « ابْتَاعِي فَأَعْتِقِي، فَإِنَّمَا الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ «. قَالَ : ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : « مَا بَالُ أُنَاسٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ، مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنْ شَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ، شَرْطُ اللَّهِ أَحَقُّ وَأَوْثَقُ «.٢٥٦١ رواه البخاري،

پوختەی ئەو فەرموودە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە تووڕە بووە کە گەورەکانی(بەریرە) ئاستەنگیان لەبەر دەم ڕزگار کردنیدا دروست کردووە بەوەی کە داوای ئەوەیان کردووە کە وەلاء و گەورایەتی بۆ ئەوان بێ، پێغەمبەری خوا فەرمووی بە عائشە تۆ بیکڕە و ئازادی بکە گوێ بە ئەوان مەدە چونکە ولاء و گەورایەتی بۆ ئازاد کارەکەیە، وەفەرموشی مەرجی ئەوان پوچە ئەگەر سەد مەرجیش دابنێن.

خاڵی گرنگ ئەوەیە کە هەر مەرجێکی ناشەرعی ببێتە ئاستەنگ لەبەردەم ئازد بوونی بەندە ڕەتکراوەیە

**٢١.** هیچ خێرێک ناگاتە ئازاد کردنی بەندە بە بەڵگەی ئەم فەرموودە: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:» لَا يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدًا، إِلَّا أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكًا، فَيَشْتَرِيَهُ، فَيُعْتِقَهُ «. وَفِي رِوَايَةِ ابْنِ أَبِي شَيْبَةَ: « وَلَدٌ وَالِدَهُ «. ١٥١٠ رواه ابوداود .



واتە هیچ ڕۆڵەیەک ناتوانێ پاداشتی دایک و باوکی بداتەوە مەگەر کۆیلە بن ڕزگاریان کا، کەواتە حەجیان بۆ بکەی یان بۆیان بەرۆژو بی یان خێر و نزایایان بۆ بکەی هیچی ناگاتە خێری ئەوەی کە ئازادیان کەی، وە دەتوانی بە ئازاد کردنیان پاداشتیان بدەیەوە.

**٢٢.** هەر کەس خزمی خۆی بوو بە کۆیلە بۆ نمونە لەشەرا کەوتە دەستی یان کڕی لە کەسێک یەکسەر کەسەکە ئازاد دەبێ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُر . ٣٩٤٩ رواه ابوداود، ١٣٦٥ رواه الترمذى ،٢٥٢٤ ابن ماجه ،٢٠١٦٧ مسند أحمد،

ئەم فەرموودە زۆر بەڕوونی دەرگا لەبەردەم ئازاد کردنی کۆیلە بە ناچاری و پێویستی زیاد دەکا .

**٢٣.** باسی ئازاد کردنی جووەیریە و مارە کردنی لە لایەن پێغەمبەرەوە علیه الصلاة والسلام لەپاشان سەد خێزان بە هۆی ئەمەوە ئازاد بون چونکە چاویان لە پێغەمبەر کرد، بۆیە جووەیریە بە بەرەکترین کەس بو بۆ قەومەکەی چونکە بە هۆی ئەو هەموو دیلەکان و کۆیلەکان ئازاد کران.

عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ : وَقَعَتْ جُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ بْنِ الْمُصْطَلِقِ فِي سَهْمِ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، أَوِ ابْنِ عَمٍّ لَهُ، فَكَاتَبَتْ عَلَى نَفْسِهَا. وَكَانَتِ امْرَأَةً مُلَاحَةً تَأْخُذُهَا الْعَيْنُ. قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : فَجَاءَتْ تَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كِتَابَتِهَا ، فَلَمَّا قَامَتْ عَلَى الْبَابِ فَرَأَيْتُهَا كَرِهْتُ مَكَانَهَا، وَعَرَفْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَيَرَى مِنْهَا مِثْلَ الَّذِي رَأَيْتُ، فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا جُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ، وَإِنَّمَا كَانَ مِنْ أَمْرِي مَا لَا يَخْفَى عَلَيْكَ، وَإِنِّي وَقَعْتُ فِي سَهْمِ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَإِنِّي كَاتَبْتُ عَلَى نَفْسِي، فَجِئْتُكَ أَسْأَلُكَ فِي كِتَابَتِي. فَقَالَ

رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « فَهَلْ لَكِ إِلَى مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ ؟ «. قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : « أُؤَدِّي عَنْكِ كِتَابَتَكِ وَأَتَزَوَّجُكِ «. قَالَتْ : قَدْ فَعَلْتُ. قَالَتْ : فَتَسَامَعَ - تَعْنِي النَّاسَ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ تَزَوَّجَ جُوَيْرِيَةَ، فَأَرْسَلُوا مَا فِي أَيْدِيهِمْ مِنَ السَّبْيِ فَأَعْتَقُوهُمْ، وَقَالُوا : أَصْهَارُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَمَا رَأَيْنَا امْرَأَةً كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً عَلَى قَوْمِهَا مِنْهَا ؛ أُعْتِقَ فِي سَبَبِهَا مِائَةُ أَهْلِ بَيْتٍ مِنْ بَنِي الْمُصْطَلِقِ. ٣٩٣١ رواه ابوداود ،٢٥٣٣٦ مسند احمد

**٢٤.** ئازاد كردن بە مەرجێكی ڕەوا و شەرعی: عَنْ سَفِينَةَ قَالَ : كُنْتُ مَمْلُوكًا لِأُمِّ سَلَمَةَ، فَقَالَتْ : أُعْتِقُكَ، وَأَشْتَرِطُ عَلَيْكَ أَنْ تَخْدُمَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا عِشْتَ. فَقُلْتُ : وَإِنْ لَمْ تَشْتَرِطِي عَلَيَّ مَا فَارَقْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا عِشْتُ. فَأَعْتَقَتْنِي وَاشْتَرَطَتْ عَلَيَّ ٣٩٣٢ رواه ابو داود ،٢٥٢٦ ابن ماجه،٢١٩٢٧ مسند احمد.

سەفینە دەڵێ من كەنیزەكی ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر بووم، وتی ئوم سەلەمە پێی وتم ئازادت دەكەم بەمەرجی ئەوەی خزمەتی پێغەمبەری خوا بكەی، وتم ئەگەر واش نەڵێی تا دەمرم لە پێغەمبەری خوا جیا نابمەوە، ئەویش ئازادی كردم.

**٢٥.** الْخَطَّابِ بْنِ صَالِحٍ ، عَنْ أُمِّهِ ، قَالَتْ : حَدَّثَتْنِي سَلَامَةُ بِنْتُ مَعْقِلٍ ، قَالَتْ : كُنْتُ لِلْحُبَابِ بْنِ عَمْرٍو وَلِي مِنْهُ غُلَامٌ. فَقَالَتْ لِيَ امْرَأَتُهُ : الْآنَ تُبَاعِينَ فِي دَيْنِهِ. فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « مَنْ صَاحِبُ تَرِكَةِ الْحُبَابِ بْنِ عَمْرٍو ؟ «. فَقَالُوا : أَخُوهُ: أَبُو الْيَسَرِ كَعْبُ بْنُ عَمْرٍو، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ، فَقَالَ: « لَا تَبِيعُوهَا، وَأَعْتِقُوهَا، فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِرَقِيقٍ قَدْ جَاءَنِي، فَأْتُونِي ؛ أُعَوِّضُكُمْ ». فَفَعَلُوا، فَاخْتَلَفُوا فِيمَا بَيْنَهُمْ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَقَالَ قَوْمٌ : أُمُّ الْوَلَدِ مَمْلُوكَةٌ ؛ لَوْلَا ذَلِكَ لَمْ يُعَوِّضْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا. وَقَالَ بَعْضُهُمْ : هِيَ حُرَّةٌ قَدْ أَعْتَقَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَفِيَّ كَانَ الِاخْتِلَافُ . ٣٩٥٣ ابوداود ،

ئەم فەرمودە باسی کەنیزەک دەکا کە گەورەکەی چۆتە لای و منالی لێی بووە کەنیزەکەکە دوای مردنی گەورەکەی دەست بە جێ ئازاد دەبێ ئەمەش ڕێگایەکی ترە بۆ ئازاد کردنی کۆیلە.

**٢٦.** ئەم فەرمودە باسی ئەوە دەکا هەر کەس لە کۆیلەکەی بدا دەبێ ئازادی بکا: عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ، قَالَ : كُنْتُ أَضْرِبُ غُلَامًا لِي، فَسَمِعْتُ مِنْ خَلْفِي صَوْتًا : « اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ، لَلَّهُ أَقْدَرُ عَلَيْكَ مِنْكَ عَلَيْهِ ». فَالْتَفَتُّ فَإِذَا هُوَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، هُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ. فَقَالَ : « أَمَا لَوْ لَمْ تَفْعَلْ لَلَفَحَتْكَ النَّارُ »، أَوْ « لَمَسَّتْكَ النَّارُ ».١٦٥٩ رواه مسلم

ئەبی مەسعودی ئەنساری دەڵێ من لەبەندەیەکی خۆمم دەدا، لە پشتەوەی خۆم گوێم لە دەنگێکی بەرز بوو، دەیوت ئەی ئەبو مەسعود چاک بزانە خوای گەورە بە دەسەڵات ترە لە دەسەڵاتی تۆ بەسەر ئەودا، ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد پێغەمبەری خوایە، وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئازادم کرد لە بەر خوا، فەرموی ئەگەر ئازادی نەکەی ئاگر داخت دەکاو دەتسوتێنێ، ئەم فەرمودە ئەوەمان پێدەڵێ کە لێدان لە کۆیلە حەرامە، وە جەزای لێدان لە کۆیلە ئازاد کردنیەتی.

٢٧. ثَلَاثَةٌ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَوْنُهُمْ : الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ، وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ «. ١٦٥٥ رواه الترمذی ،٣١٢٠ النسائی، ٧٤١٦ مسند أحمد .

سێ کەس هەن خوای گەورە لە فەزڵ و کەرەمی خۆی لەسەر خۆی پێویست کردوە کە یارمەتیان بدا، ئەو کەسەی لە پێناوی خوادا جیهاد دەکا، ئەو بەندەیەیی دەیەوێ خۆی ئازاد کا لەدەست گەورەکەی، ئەو کەسەش کە بۆیە ژن دێنێ یان شوو دەکا بۆ ئەوەی خۆی پاک ڕابگرێ لە گوناە، کەواتە خوای گەورە حەتمەن یارمەتی ئەو کەسە دەدا کە دەیەوێ خۆی ڕزگار کا لە کۆیلایەتی.

٢٨.ئەو فەرمودەیە باسی ئەوە دەکا سێ کەس لە قیامەتدا خوای گەورە خۆی دەبێتە نەیار و دژیان، یەکێک لەوانە ئەو کەسەیە کە کەسێکی ئازاد دەکاتە بەندە و دەیفرۆشێ:  عن هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ : « قَالَ اللَّهُ : ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ : رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ «.رواه البخاری ٢٢٢٧،

٢٩. سزای ئەو کەسەی کە زلەیەک بدا لەبەندەکەی ئەوەیە کە ئازادی کا : مَنْ لَطَمَ مَمْلُوكَهُ، أَوْ ضَرَبَهُ، فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُعْتِقَهُ «.رواه مسلم ١٦٥٧

٣٠.پێغەمبەری خوا کە وەفاتی کردووە نە زێڕی بە جێ هێشتەوە نە زیو، نە کۆیلە نەکەنیزەک، تەنیا ئێسترە سپیەکە و سیلاحەکە و زەویەک نەبێ کە کردبویە وەقف بۆ خێر: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا وَلَا دِينَارًا، وَلَا عَبْدًا وَلَا أَمَةً، وَلَا شَيْئًا، إِلَّا بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ، وَسِلَاحَهُ، وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً. رواه البخاري ٢٧٣٩ .

ئەم فەرموودەیە یەکلا کەرەوەیە لە مەوقیفی پێغەمبەر کە وەفاتی کردوە هیچ کەنیزەک و کۆیلەی بە جێ نەهێشتوە، کەواتە لەبەرامبەر قورئان و سونەتی پێغەمبەر هیچ بەڵگەیەک بە بەڵگە ناشێ، خۆزگە بەڵگەمان بە پێغەمبەر دێنایەوە نەوەک بە سیرەی مەلیک و پادشاو قسەی زانایان.

**٣١.** ئەگەر لەبەر درێژ بونەوە نەبا بۆ ئەوەی خوێنەر بێتاقەت نەبێ هێشتا بەڵگە زۆر بوو لە سونەتی سەحیح و سەریحی پێغەمبەر باسی بکەین علیه أفضل الصلوات وأزكى التسليمات، من دەڵێم حەیف ئەو دینە جوان و ڕوونەمان هەیە بەڵام سەرمان لە خۆمان شێواندوە.

## بەشی حەوتەم

# ئازادی کۆیلە
# لە سیرەی سەروەرماندا





## ئازادی كۆیله
## له سیرەی سەروەرماندا



له دوای ئەوەی كه باسی ئازاد كردنی كۆیلەمان كرد له قورئان و سونەت دا، دەمەوێ باسی ئازادی كۆیله بكەم له سیرەت و ژیانی پێغەمبەردا، به تایبەت له ژیانی مەكی و مەدەنی دا، وه بەتایبەت تر له غەزەواتەكاندا بەچەند خاڵێك.

**١.** ئەگەر بێتوو به مێژوودا بگەڕێینەوه و بچینەوه سەردەمی پێغەمبەری ئازیزمان دەبینین تەشریفیان له پێش پێغەمبەرایەتیشی بەندەی ڕزگار كردووه، یەكێك لەوانه زەیدی كوڕی حارسه بووه كه كاتی خۆی كۆیلەی حەكیمی كوڕی حیزام بوو ئەویش دای به خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، ڕەزای خوا له هەردووكیان بێ، وه خەدیجەش زەیدی دا به پێغەمبەری خوا. پێغەمبەری خوا نەوەك هەر ئازادی كرد بەڵكو كردی به كوڕی خۆی، كه ئەمه له ناو عەرەبدا باو بووه، كه ئەم جۆره كوڕانه میراتیان دەبرد له بەناو باوكەكان و ئەوانیش میراتیان لێدەگرتن، وه هەتا ئەو باوكه لێی حەرام بوو خێزانی بەناو كوڕەكانیان بێنن دوای مردن و تەڵاقدانی كوڕەكان، هەتا دواتر یاسای بەكوڕ كردن له ئیسلامدا هەڵوەشایەوه.

**٢.** هەر لەسەردەمی سەرەتایی قوناغی مەكیدا كه ئەبوبەكر چەندین كۆیلەی ڕزگار كرد، ئەمه نیشانەی ئەوەیه كه ئیسلامەتی لەسەرەتای هاتنیەوه به پەرۆشەوه بووه بۆ كۆیله ئازاد كردن هەر بۆیه چەندین كۆیلەی ئازاد كرد، وەك بیلال، عامری كوری فەهیره، دایكی عومەیس،



زەنیرە، نەهدیە و کچەکەی، کەنیزەکێک لە بەنی موئەمیل کە مسوڵمان ببوو ئەویشی ڕزگار کرد، ئەمە ئەوەمان پێدەڵێ کە ئیسلام چەند تینوی ئازادییە، هەر بۆیە ئەبو بەکر بەم شاکارە جوانە دەستی بە دەعوە کرد لە دوای ئیمان هێنانەکەی، وە دەیزانی بەم کارەی چەند دڵی پێغەمبەر خۆش دەبێ علیه الصلاة والسلام.

**٣.** جابر دەفەرموێ: ڕەزای خوای لێبێ عومەر دەیگوت ڕەزای خوای لێبێ: گەورەمان گەورەمانی ڕزگار کرد. قَالَ : كَانَ عُمَرُ يَقُولُ : أَبُو بَكْرٍ سَيِّدُنَا. وَأَعْتَقَ سَيِّدَنَا، يَعْنِي : بِلَالًا.،٣٧٥٤ رواه البخاری. مەبەستی ئەوەبوو دەیوت ئەبوبەکر بیلالی ڕزگار کرد. ڕەزای خوا لە هە موویان بێ، دەبینین عومەر چەند شانازی بە ئازادی بیلالەوە دەکا لە لایەن ئەبوبەکرەوە.

**٤.** حەکیمی کوری حیزام پێشتر باسمان کرد سەد بەندەی لە دوای مسوڵمان بوونی ئازاد کرد وەک لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە: أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَعْتَقَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، فَلَمَّا أَسْلَمَ حَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، وَأَعْتَقَ مِائَةَ رَقَبَةٍ. قَالَ : فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا - يَعْنِي أَتَبَرَّرُ بِهَا - قَالَ : فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ لَكَ مِنْ خَيْرٍ ٢٥٣٨ رواه البخاری.

باشە ئەگەر ئازاد کردنی کۆیلە شانازی نییە لە ئیسلامدا حەکیم چ مەجبورە سەد بەندە لە دەست خۆی بدا !؟.

**٥.** لە یەکەم ڕوو بەڕوو بوونەوەی مسوڵمانان لە گەڵ هاوبەش پەرستەکانی مەکە مسوڵمانان سەرکەوتن، وە هەفتا دیلیان هەبوو، وە لە دوای پازدە ساڵ دژایەتی قورەیش بۆ پێغەمبەر و مسوڵمانان بەڵام پێغەمبەری خوا

کەسیانی نەکرد بە کۆیلە، بەڵکو لە بەرامبەر ماڵ و سامان دا ئازادی کردن لە بری پازدە ساڵ تالانی کە دژی مسوڵمانان ئەنجامیاندا.

**٦.** لەغەزوەی ئوحودا هیچ دیلێک نەکەوتە دەستی مسوڵمانان باسی کۆیلە لە ئارادا نەبوو.

**٧.**لە غەزوەی بەنی موستەڵەق کە حارسی باوکی جووەیریە ویستی بەسەر خەڵکی مەدینەدا بدا بەڵام پێغەمبەر وەک کەسێکی شارەزا لە تاکتیکی شەڕ ئەو زوتر بەسەر ئەوانی دادا، کەوتنە ژێر دەستی، وە کچەکەی حارس کەوتە دەستی پێغەمبەر، ئەویش ئازادی کرد لە دواتر هەموو مسوڵمانان هەموو دیلەکان و کەنیزەکەکانیان ئازاد کرد، باشە ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئایا پێغەمبەری خوا ئازاد کردنی داهێنا یان کۆیلە کردن؟.

**٨.** بەنی نەزیری یەهودی ویستیان بە پلانێک پێغەمبەری خوا شەهید کەن لەدوای هەبوونی پەیماننامەی توند و تۆڵ و نوسینەوەی دەستور بەیەکەوە بۆ ژیان کردن لە مەدینە، پێغەمبەری خوا دەورەی ئەوانی گرت و ناچاری کردن خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام تاکە یەکێکیانی لێ نەکردن بە دیل و بە کۆیلە بەڵکو ڕێگای ئەوانی دا بڕۆن ئەو شوێنە جێ بێڵن، ئایا هیچ کات دووژمنانی پێغەمبەر ئەوەیان لەگەڵ پێغەمبەر کرد؟ بەدڵنیایی نەخێر.

**٩.**بەنی قەینوقاع ی جولەکە دەست درێژیان کردە سەر ئافرەتی مسوڵمانان و مسوڵمانێکیشیان شەهید کرد، کە ئەمە مانای هەڵوەشاندنەوەی پەیمان نامە بوو، بەڵام دیسان پێغەمبەری خوا دەورەیان گرت و نەیانتوانی بەرگری بکەن بۆیە تەسلیم بوون، بەڵام دیسان پێغەمبەری خوا تەنیا بەدەرکردن لە وان خۆش بوو لەکاتێکدا دەیتوانی هەموویان بکاتە کۆیلە، ئەی بۆ نەیکرد ئایا دەرفەتێکی باش نەبوو بۆ بەکۆیلە کردن کە قورئانی مەکی و مەدەنی پریەتی لەباسی خیانەتی جولەکە؟.



**١٠.** لەغەزوەی ئەحزاب لە دوای زیاتر لە پازدە ڕۆژ لە دەورە درانی مسوڵمانان لە لایەن جولەکەکانی بەنوو نەزیر کە چوونە خەیبەر و خەڵکیان دژی مسوڵمانان کۆکردەوە، وە جولەکەکانی خەیبەر و کافرەکانی قورەیش و کافرەکانی بەنی غەتەفان بۆ ئەوەی بەیەکجاری مسولمانان لە ناوبەرن، دوای ئەو ماوەیە مسوڵمانان بە موعجیزە ڕزگاریان بوو لە دەستی ئەو هەموو دووژمنە، بەڵام جولەکەکانی بەنی قورەیزە کە خیانەتی گەورەیان بە مسوڵمانان کردوو لە پشتەوە خەنجەریان لە مسوڵماناندا، پێغەمبەری خوا ئەوانی بە سزای دادگەرانەی خۆیان گەیاند، ئەم بابەتە زۆرترین قسەی لەسەر کراوە لە لایەن مەسیحی و مولحید و مسوڵمانە بێ خەبەرەکان لەڕاستی ڕووداوەکە من بە پۆستێکی سەر بەخۆ باسی دەکەم بە پشتیوانی خوا بۆیە لێرە لەسەری ناڕۆم، بەس ئەوەندە دەڵێم ئەوان بەسزای دادگەرانەی خۆیان گەیشتن، ئەگەر جولەکەکان لە جێی مسوڵمانەکان بونایە تاقە یەک کەسیان نەدەهێشت.

**١١.** لە دوای ئەوە فەتحی خەیبەر ڕوویدا چونکە خەڵکی خەیبەر بوون ئەحزابیان دژی مسوڵمانان هاندا و ١٠ هەزار چەکداریان کۆکردەوە و ویستیان مسوڵمانان بنە بڕ کەن بەڵام پلانەکەیان سەری نەگرت، بۆیە پێغەمبەری خوا ویستی تۆڵەیان لێ بکاتەوە، وە بەسەریاندا زاڵبوو وە هەموو قەڵاکانی گرتن، وە شەڕ دروست بوو لەم جەنگەدا دوای زیاتر لە دە ڕۆژ نزیکەی دووسەد کەس لە هەردوولا کوژرا، بەڵام جەنگەکە لە بەرژەوەندی مسوڵمانان کۆتایی پێهات، ئەوانیش کەوتنە ژێر دەستی پێغەمبەرو مسوڵمانان، بەڵام پێغەمبەر لە جیاتی تۆڵە ساندنەوە و لەناو بردن و قڕکردن وەک ئەوان پێشتر ویستیان بیکەن لە ئەحزاب سوڵحی لەگەڵدا کردن و زەویەکانی پێدانەوە و ساڵانە دەرامەتی زەویەکانی بە ئەندازەی دیاری کراو لێوەر دەگرتن، وە هەر لەو جەنگەشدا(سەفییەی




کچی حویەی ئەختەب کەوتە دەست پێغەمبەر لەدوای ئەوەی کە ئازادی کرد مارەی کرد، بەڵکو ئازدکردنەکەی مارەییەکەی بوو، وە ئەو دووجار پێشتر خەوی بە پێغەمبەری خواوە بینیبوو کە دەبێتە خێزانی پێغەمبەر لە هەموو ژیانیدا بە یەک جاریش پێغەمبەری نیگەران نەکرد. خەڵکی خەیبەر ئەگەر بەدادگەری بایە نەوەک بە کەرەم و بەخشندەیی پێغەمبەر، دەبوو بنەبڕکرابن وەک ئەوان ویستیان وا بکەن بەڵام پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەو خیانەتە گەورە سولحی لەگەڵدا کردن وە دەریشی نەکردن.

**١٢.** لە فەتحی مەکەدا پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام توانی لە دوای بیست و یەک ساڵ دژایەتی سەرسەختانەی قورەیش بۆ بەڕێزیان توانی بەسەریاندا زاڵ بێ، ئەوان بێ دەسەڵات کەوتنە دەستی پێغەمبەر بەڵام لە جیاتی تۆڵە سەندنەوە و بە کۆیلە کردن پێی فەرموون(إذهبوا فأنتم الطلقاء) نەیفەرموو: فأنتم الارقاء، خۆزگە ئێمەی مسوڵمان لە قورئان و سونەت و سیرەتی پێغەمبەر دەگەیشتین .

**١٣.** لە دوای فەتحی مەکە هەر لەم ساڵەدا واتا لە ساڵی هەشتەمی کۆچی پێغەمبەر بەسەر خەڵکی تائیف و ئەوتاس دا زاڵ بوو بە پێی ڕیوایەتەکانی سیرە زیاتر لە شەش هەزار ئافرەت و مناڵ کەوتە دەست پێغەمبەرو هاوەڵان، بەڵام پێغەمبەر لەدوای ١٠ بۆ ١٥ ڕۆژ هەوڵدان توانی هاوەڵانی ڕازی بکات و هەموو خێزان و مناڵەکانی بۆ هەوازین و ئەوتاس بگێڕێتەوە.

**١٤.** لێرەدا دوو کەس خیانەت دەکەن بە مێژووی ڕاستەقینەی ئیسلام .

**یەکەم:** ڕۆژهەڵاتناس و جولەکە و مەسیحی و خزمەت کارەکانیان لە مولحید و علمانیەکان.

**دووەم:** ئەو زانا مسوڵمانانەی لە بەر هەڵە تێگەیشتن لە روحی دین و ئامانجی شەریعەت باسی ئازاد کردنی هەوازین و ئەوتاس ناکەن، بەڵکو بەس باسی گیران و بە کۆیلە کردن دەکەن و شانازی پێوە دەکەن.

**١٥.** دواتر لە شەڕی موئتە و تەبوک کەس نەکراوە بە دیل و کۆیلە لە لایەن مسوڵمانانەوە، لە شەڕی موئتە زەیدی کوری حارس کە پێشتر باسمان کرد ، وە جەعفەر و عەبدوڵلەی کوری رەواحە کە یەک لە دوای یەک شەهید بوون، دواتر خالید توانی مسوڵمانان دەرباز بکا لە جەنگەکە، وە لە غەزای تەبوکیش جەنگ ڕووی نەدا هەتا کەس بکرێتە کۆیلە، بۆیە تکایە زانایانی دینی، بە کۆیلە کردن داهێنراوی مسوڵمانان نییە، بەڵکو داهێنراوی مل هورِ و فیرعەونەکانی مێژوو بووە بۆیە خۆی لێ مەکەنە خاوەن و شانازی پێوە مەکەن، والله جێگای شانازی نییە، بەڵکو شەرمەزارییە بە نێوچاوانی مرۆڤایەتیەوە.

**١٦.** وە پێغەمبەری سەروەرمان علیه الصلاة والسلام لە وتاری حەجی ماڵئاوایی وەسیەتی مسوڵمانانی دەکرد دەیفەر موو: لەخوا بترسن ئاگاتان لە ئافرەتان و کۆیلەکان بێ، من سەرم سوڕماوە بۆچی گوێمان لەو هەموو ئایەت و حەدیسە نەگرت تەنیا گوێمان لە مێژوو گرت بۆیە ئەو بۆ چوونە هەڵانە دروست بوون بەداخەوە.

# بەشی هەشتەم

## ڕوونکردنەوەیەك لەسەر غەزوەی

## بەنو قورەیزە لە قورئان و سونەت و سیرەدا



## ڕوونکردنەوەیەك لەسەر غەزوەی

## بەنو قورەیزە لە قورئان و سونەت و سیرەدا

**دەکرێ ئەم بابەتە لە چـــەند خـــاڵێکدا ڕوونکەینەوە بۆ ئـــەوەی لە ڕاستی ڕووداوەکە تێبگەین.**

**١.** پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام لەگەڵ هاتنی بۆ مەدینە پەیماننامە و دەستورێکی ئیمزا کرد لە گەڵ جولەکەکان بە هەرسێک هۆزەکەوە، بەنو نەزیر، بەنو قەینوقاع، بەنو قورەیزە، وە هیچ کەم کوڕیەک لە پێغەمبەرەوە ڕووی نەداوە، بەڵام جولەکەکان وەک پیشەی هەمیشەی خۆیان خیانەتیان تۆمار کرد و بە دانپێدا هێنانی خۆیان پەیماننامەکەیان بەکردەیی هەڵوەشاندەوە، بەنو نەزیر بەوەی کە ویستیان پێغەمبەر شەهید بکەن، بەنو قەینو قاع بەوەی کە دەستدرێژیان کردە سەر ئافرەتی مسوڵمانان، بەنو قورەیزە کە خیانەتی گەورەیان بە پێغەمبەری خوا کرد.

**٢.** ئەحزاب کە پێک هاتبوو لە جولەکەکانی خەیبەر و کافرەکانی بەنی غەتەفان و هاوبەش پەرستەکانی مەکە بە فیتی جولەکەکانی خەیبەر هەموویان کۆبونەوە و ویستیان بۆ هەمیشە مسوڵمانان بنەبڕکەن ئەمە خودی ئامانجەکە بوو.

**٣.** حویەیی خوڕی ئەختەب بۆ ئەم کارە پێویستی بە یارمەتی جولەکەکانی بەنو قورەیزە بوو بۆ ئەوەی لە نزیکترین سەنگەرەوە گورزی گورچک بڕ بدەن لە مسوڵمانان، چونکە بەنو قورەیزە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی مەدینە بوون بەڵکو نزیکترین سەنگەر بوون لە مەدینە، حویەیی خۆی



گەیاندە بەنی قورەیزە و چۆ بۆ ماڵی سەرۆکەکەیان کە ناوی کەعبی کوری ئەسەد بوو، کاتێک کە لە دەرگای دا ناسی، کەعب وتی دەرگات لێناکەمەوە دەزانم بۆچی هاتووی، حویەی وتی هاتووم پری دونیا عیزەت و خۆشیم بۆ هێناوی، ئەویش وتی پڕی دونیا زەلیلیت بۆ هێناوم، ئەویش کە زانی دەرگای لێناکاتەوە تاوان باری کرد بەوەی کە ترسنۆکە و چروکە و پیاوی میوانداری نییە بۆیە دەرگای لێ ناکاتەوە، ئەویش ئەم قسەیە زۆر کاری تێکرد بە ناچاری دەرگای کردەوە، حویەیی ئامانجەکەی بۆ باس کرد کە بۆ ئەوە هاتوون مسوڵمانان بۆ یەکجاری بنەبڕ بکەن سوپایەکی گەورەی کۆکردۆتەوە بۆ ئەو مەبەستە، وتی حویەی لێم گەرێ تا ئێستا هیچ بێ بەڵێنیەکم لەو پیاوە نەدیوە من پەیمان ناشکێنم بەڵام دواتر هەرچۆن بێ قەناعەتی پێکرد کە پشتی مسوڵمانان بەرداو خیانەت بکا، ئەوەبوو ڕازی بوو بە پێشنیارەکەی.

٤. لە دوای ئەوەی کە ئەحزاب تێک شکان و دەورەی مەدینەیان بەردا ئەوجار نۆبەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا تۆڵە بکاتەوە لە بەنی قورەیزە چونکە خیانەتیان کردبوو، چونکە بەڵێن وابوو بەیەکەوە جولەکەو مسوڵمانان بەرگری لە مەدینە بکەن لە دژی دووژمنی دەرەکی، بەڵام ئەوان بە پێچەوانەوە دەستی دووژمنی دەرەکیان گرت و یارمەتییان دا، وە یارمەتی گەورەیان پێشکەشی دووژمنان کرد نزیکەی بیست بار تفاق و پێداویستیان دا بە ئەحزاب هەروەک سەرچاوەکانی سیرە باس دەکەن،

٥. پێغەمبەری خوا دەوری ئەوانی گرت بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ هەتا دواتر بەناچاری تەسلیم بوون بەوەی کە پێغەمبەری خوا دەرچەیەکی بۆ کردنەوە بەوەی کە حەکەمێک بۆ خۆیان هەڵبژێرن حوکمیان لەسەر بدا، دیارە ئەمە ئەوپەری جوامێری و گەورەی پێغەمبەری خوا بوو



لەگەڵیاندا دەنا دەیتوانی بێ هیچ ناوەندگیرێک بنە بڕیان بکا، ئەوانیش ڕازی بوون بەوەی کە سەعدی کوری مەعاز بەسەریانەوە حەکم بێ و بە حوکمی ئەو ڕازی دەبن، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا بەوە ڕازی بوو ناردی بە شوێن سەعدی کوڕی مەعازدا، کاتێک کە هات هەر لەهەمان شەردا بەسەختی بریندار بوو وە دوعای کرد  بەوەی کە پەروەردگار نەیمرێنێ هەتا چاوم بەسەر کەوتنی مسوڵمانان ڕوون دەکەی، خوای گەورەش نزاکەی گیرا کرد، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو ئەی سەعد ئەوان داوادەکەن کە تۆ حوکمیان بەسەردا بدەی، سەعد ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو وتی ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە تۆڵەی ئەم خیانەتەیان لێ بکەمەوە، ئەوەبوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا بڕیاری من دەربارەی ئەوان ئەوەیە کە جەنگاوەرەکانیان بکوژی ئەوانی تر (بەدیل بکەی): عنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ أُنَاسًا نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَجَاءَ عَلَى حِمَارٍ، فَلَمَّا بَلَغَ قَرِيبًا مِنَ الْمَسْجِدِ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « قُومُوا إِلَى خَيْرِكُمْ « أَوْ « سَيِّدِكُمْ «، فَقَالَ : « يَا سَعْدُ، إِنَّ هَؤُلَاءِ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِكَ «. قَالَ : فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ أَنْ تُقْتَلَ مُقَاتِلَتُهُمْ، وَتُسْبَى ذَرَارِيُّهُمْ. قَالَ : « حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللَّهِ «، أَوْ « بِحُكْمِ الْمَلِكِ «.رواه البخاري ٣٨٠٤

حوکمەکەی سەعد ئەوەبووە کە جەنگاوەرەکان بکوژرێن و ماڵ و خێزانەکانیان بکرێن بە (سەبایا) .

٦.ئایا جیاوازی لە وشەی قورئان و وشەی فەرموودەکە هەیە؟ قورئانی پیرۆز لە هەمان ڕووداو دەفەرموێ: وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمۡ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ فَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقٗا ﴿٢٦﴾ الأحزاب



واتە: ئەوانەی پشتگیری قوڕەیشیەکانیان کرد لە خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکان، لەجووەکانی (بنی قریزة) خوای گەورە لە قەڵاکانیان دایگرتن، ترس و بیمی فڕێدایە دڵیان، تا وایان لێهات، دەستەیەکتان کوشتن و دەستەیەکیشتان بەدیل گرتن.

گوومان لەوەدا نییە حوکمی ئەسیر لە قوڕئاندا سێ شتە، یەک کوشتن، دوو بێ بەرامبەر ئازاد کردن، سێ ئازاد کردن بەرامبەر پارە، یان، دیلی مسوڵمانان، یان قازانج گەیاندنێک بە مسوڵمانان، لە قوڕئاندا باسی بە(سەبایا) کردن نییە وەک لە حەدیسەکەدا هاتووە، بەڵام ئایەتەکە لە فز و واتاکەی لە خواوەیە بەڵام فەرموودە واننییە جاری وایە لە فزەکەی لە پێغەمبەرەوەیە، جاری وایە لە سەحابیەوەیە، جاری وایە لە ڕاویەکەوەیە، بۆیە زۆر ئاساییە دەبینین باسی شتێک بە چەندین داڕشتن هاتووە، وە هەم لەبەر ئەوەی لە سەدەی یەکەم و دواتریش فەرموودە بە مانا ڕیوایەت کراوە، بۆیە وشە قوڕئانیەکە دەقیقە و وردە و هیچ هەڵەی تێدا نییە کە ئەوان دیل بوون نەوەک(سەبایا) کۆیلە و کەنیزەک، وەک وتمان حوکمی دیلیش لە قوڕئانی پیرۆزدا ڕوونە.

٧. باشە ئەوە دامان نا وشەی (سەبایا) بێ گرفتە و هیچ کێشەی نییە کە بێ گوومان هەیەتی بەڵام ریوایەتەکانی سیرە تێکەڵ و پێکەڵە، بەڵام لە قورئان و سونەتی سەحیح دا بێ گرفتە، گرفتی سونەتە سەحیحەکە تەنیا ئەو وشەیەیە بەڵام ئەویش بە قوڕئان ڕاست دەکرێتەوە و کێشەمان نییە.

٨. سەبارەت بە ژمارەی بەدیل گیراوەکان ڕاجیایی زۆرە لە چل کەسەوە تا دوو سەد کەس تا شەش سەد، تا نۆ سەد کەس، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ هیچ شتێکی دەقیق دەربارەی ژمارەی گیراوەکان نییە هەتا

هەندێک سەرچاوە باس لەوە دەکا ژمارەی ئافرەتە کۆیلەکان ئەوەندە زۆر بوە ناردویانن بۆ شام و بۆ نەجد و بۆ شوێنەکانی تر، لە هەندێک سەرچاوە باس لەوە دەکرێن کە لە ماڵی کیسەی کچی حارس حەبس کراون تا کوژراون، باشە ئەگەر لەماڵی ئافرەتێک جێگایان بوبێتەوە دەبێ ژمارەیان چەند بوبێ؟!

٩. بەنو قورەیزە خیانەتی گەورەیان کرد، ئەوەی ئەوان کردیان دەچێتە بازنەی خیانەت ئایا سزای خیانەت چیە؟

١٠. ئەوەی ئەوان کردیان دەچێتە بازنەی جاسوسی ئایا لە ئێستا دا وەڵاتانی پێش کەوتو چۆن سیخوڕ سزا دەدەن بە تایبەت ئەو سیخوڕیەی ڕووخاندنی وەڵاتێکی لێبکەوێتەوە.

١١. ئەوەی ئەوان کردیان بە زاراوەی ئەوڕۆ دەچێتە بازنەی تیرۆرەوە ئایا سزای تیرۆرست چییە لەمڕۆدا؟!

١٢. پێغەمبەری خوا سزای کوشتنی بەسەر بەنو نەزیر و بەنو قەینوقاع دا نەسەپاند، ئەی بۆ ئەوانی بەم سزایە سزادا؟ چونکە ئەوان شایەنی ئەو سزایە بوون.

١٣. ئەگەر ئەوان بەسەر مەدینەدا زاڵ بووبان بێ گومان کەسیان نەدەهێشت نە پیاو نە ژن نە منالّ، بەڵام پێغەمبەری خوا قەت ئافرەت و منالّ و پیر و گۆشە نشینەکانی نە کوشتوە وەک لەو فەرمودانەدا هاتوە: مَا بَالُ أَقْوَامٍ جَاوَزَهُمُ الْقَتْلُ الْيَوْمَ حَتَّى قَتَلُوا الذُّرِّيَّةَ ؟ « فَقَالَ رَجُلٌ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا هُمْ أَوْلَادُ الْمُشْرِكِينَ. فَقَالَ : « أَلَا إِنَّ خِيَارَكُمْ أَبْنَاءُ الْمُشْرِكِينَ »، ثُمَّ قَالَ : « أَلَا لَا تَقْتُلُوا ذُرِّيَّةً، أَلَا لَا تَقْتُلُوا ذُرِّيّة، رواه احمد ١٥٥٨٩

پێغەمبەری خوا دەفەرمویَ ئەوە بۆ خەڵکانێک هەن منالًیشیان کوشتووە؟ یەکێک وتی ئاخر ئەوانە منالًی هاوبەش پەرستەکانن، پێغەمبەر فەرموی باشترینی ئێوە پێشتر هاوبەش پەرست بووە، بۆیە ئاگادار بن منالً مەکوژن.

مَا كَانَتْ هَذِهِ لِتُقَاتِلَ «. فَقَالَ لِأَحَدِهِمُ : « الْحَقْ خَالِدًا، فَقُلْ لَهُ : لَا تَقْتُلُوا ذُرِّيَّةً وَلَا عَسِيفًا «.رواه احمد ١٥٩٩٢

لە غەزوەیەکدا ئافرەتێک کوژرابوو پێغەمبەری خوا فەرمووی نابێ ئافرەت بکوژرێ، وتی بگەن بە خالید پێی بڵێن منالً و کرێکار مەکوژن.

أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : « اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَقَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا، وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تُمَثِّلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا «. رواه ابوداود ٢٦١٣

**ئەمە یاسای جەنگ بووە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم:**

- جەنگ کردن لە پێناوی خوا.
- وە بەناوی خوا.
- جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوەی بێباوەڕە بە خوا، وە (المحارب)جەنگاوەرە دژی مسوڵمانان .
- پەیمان مەشکێنن.
- دزی و گەندەڵی مەکەن.
- ئەتک کردن مەکەن.
- منالً مەکوژن.

**١٤.** دەوترێ ئەم گیراوانە لە ناو بازاری مەدینەدا چاڵیان بۆ هەڵ کەنراوە و لەوێدا کوژراون، هەتا ئێستاش شوێنەوارەکان لە مەدینە هەرماون و شوێنەکان خەڵک دەیانزان ئەگەر خودی شوێنەوارەکەش نەمابێ، ئەرێ کەسێک ئەو چاڵانەمان نیشان بدا کە سەدان کەسی تێدا کوژراوە، کە بێگوومان شتی وا نییە.

**١٥.** لە سونەتی سحیح دا ئەو زانیاریانە نەهاتوون بەڵکو لە سیرە و لە مغازی دا هاتووە، کە سیرەو مغازی بەمەرجی حەدیس ریوایەت نەکراوە، بە تایبەت ئیبن ئیسحاق و واقدی و ئیبن هشام قسەی زۆریان لەسەرە، من ناڵێم لە هەموو ریوایەتەکان دا ئیشکال هەیە، بەڵام لانی کەم وردەکاری تێدا نەکراوە.

**١٦.** لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ ئەخلاقیاتی پێغەمبەر دا نایەتەوە ئەم جۆرە کوشتن و سزا دانە.

**١٧.** ئەوانەی کە ڕەخنە دەگرن لە بەنی قورەیزە بۆچی باسی خیانەتی بەنی قورەیزەش ناکەن، ئەی بۆچی باسی هەڵوێستی پێغەمبەر ناکەن کە پێشتر لە گەڵ بەنی نەزیرو قەینوقاع دا کردی، وەک بڵێی بانێکە و دوو هەوا.

**١٨.** جولەکە لە ئەوروپا دەڵێ هۆڵۆکۆست کراوین و شەش ملیونمان بەدەستی ئەوروپاییەکان کوژراوە ئەی بۆ باسی ئەوە ناکەن کە هێندەیان پەرۆشی جولەکەیە.

**١٩.** داتاکانی فەلەستین باس لە سەد هەزار کوژراو دەکەن بە دەستی جولەکە بێ هیچ پاساو و هەقێک ئەو برادەرە مولحیدانە جارێک ویژدانیان نەجوڵاو باسی خراپی ئەو تاوانانەیان نەکرد خێر، بۆ باسی چەند خیانەت کارێکی مێژوو نابڕێتەوە بەڵام باسی سەدان هەزار کوژراوی دەستی

جولەکە ناکەن وە ڕۆژانە بە بەرچاوی دونیاوە زەوی داگیر دەکەن و خانوی لێدەکەن و مسولْمان لەو شوێنە دەردەپەڕێنن.

**٢٠.** وە رۆژانە خەڵک لە زیندان دەکرێ و بێ سەر و شوێن دەکرێ و مسولْمان سەگی تێبەردەدرێ و ئافرەت ئەتک دەکرێ، ئەرێ بۆ هەڵوێستیان نییە؟ ئەوە ئێمە دەخاتە بەردەم سێ پرسیارەوە.

- یان ئەوانە درۆ دەکەن لە گەڵ مافی مرۆڤ و باسی مرۆڤ.
- یان بەکرێ گیراون و پێ یان سپێردراوە کە ئەوە بڵێن.
- یان نەزانن بە ڕاستی مێژوو و روحی ئیسلام.

وەک عەرەب دەڵێن (أحلاهما مر) واتە شیرنترینیان تاڵە.

ئەم بابەتە زۆری دەوێ بەڵام من بە ئەوەندە واز لەو بابەتە دێنم بەڵکو لەدەرفەتی تردا لێکۆڵینەوەی تایبەتی لەسەر بکەین.

السیرة النبویة : لابن هشام

صحیح تأریخ الطبری : تحقیق محمد بن طاهر البرزنجی

السیرة النبویة للصلابی

## بەشی نۆیەم

# مافي كۆيله و كەنیزەك له ئیسلامدا





## مافي كۆيله و كەنيزەك لــە ئيســلامدا



باسمان لەوە کرد کە کۆیلە بوون داهێنانێکی ستەم کارانەیە نەوەک داهێنانێکی دینیانە و ئیسلامیانە، بەڵام کە ئەگەر بوو دەبێ مافەکانی ڕەچاو بکرێ، بەشێک لەو مافانە ئەمانەن.

**١.** یەکەم مافی ئەوەیە کە لەگەڵ تەواوی مرۆڤەکان یەکسانە و هیچ جیاوازی نییە، هەرچی ڕێز و حورمەتێک بۆ مرۆڤ هەبێ بۆ ئەویش هەیە: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ٧٠﴾ الأسراء

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە و بەسەر وشکانی و دەریادا (بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون و لە ڕزق و ڕۆزی پوخت و چاکی جۆراو جۆر بەهرەوەرمان کردوون (لە خۆراک و پۆشاک و ماڵ و ناوماڵ و ... هتد) بەڕاستی ئێمە ڕێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدی هێنراوانەدا کە دروستمان کردوون (لە هەموو ڕوویەکەوە، تا قەدر و ڕێزی خۆیان بزانن).

**٢.** نابێ بە چاوی سوک و کەم سەیر بکرێ چونکە حەقیقەتی مرۆڤەکان پلەو پۆستی ئیداری و کۆمەڵایەتی نییە بەڵکو ناخ و بیر و باوەر و ڕەوشتیان و ڕۆشنبیریانە.

**٣.** مافی بەندە ئەوەیە کە بەندە نە مێنێ و ئازاد بکرێ بە هەموو شێوەکان.

**٤.** بەندایەتی چینایەتی دروست دەکا، بۆیە مافی بەندەیە جیاکاری پێ نەکرێ، لە بەر ئەوەی هەموومان لە ئادەم و حەواین و ئەوانیش لە خۆڵن.

**٥.** مافی بەندەیە و ئەرکی مسوڵمانانە ئازاد بکرێن لە کاتی ڕوودانی کوشتنی بە هەڵە.

**٦.** دەبێ ئازاد بکرێن لە کاتی وێچواندنی خێزان بە یەکێک لەو مەحرەمانەی کە پێی ناشێن.

**٧.** مافی بەندەیە ئازاد بکرێ لە کاتی ئەوەی کەسێک لە ڕەمەزان لە کاتی بە ڕۆژوو بوونا توشی سەرجێی خێزانەکەی دەبێ.

**٨.** مافی خۆیەتی ئازاد بکرێ لەسەر حیسابی زەکات.

**٩.** مافی خۆیەتی ئازاد بکرێ لەکاتی داواکردنی ئازاد کردن، واتە پێویستە مکاتبەی لەگەڵدا بکرێ.

**١٠.** دەبێ لەکاتی مامەڵەی ئازاد کردن لە بەشێکی ببەخشرێ.

**١١.** دەبێ پارەی پێدانی ئازاد کردنەکەی بۆ بکرێتە قیست و بەش بەش بە پێی توانای داریی و لێهاتویی.

**١٢.** دەبێ دەوڵەمەندەکان هاوکاری خۆ ئازادکردنەکەی بن .

**١٣.** نابێ ناچار بکرێن بۆ کاری بەد ڕەوشتی.

**١٤.** نابێ شتێکیان لێ داوا بکرێ کە لە توانایی ئەواندا نەبێ، هەموو ئەوانەی باسمان کرد لە چوار چێوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا جێگای دەبێتەوە کە دەفەرموێ:



وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ النور

واتە: دەبا ئەوانەی هاوسەریان دەست ناکەوێت هەوڵ بدەن داوێنی خۆیان پاک ڕابگرن، هەتا خوا لە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات، ئەو کەسانەش کە دەیانەوێت خۆیان ڕزگار بکەن لە بەندەکانتان و خۆیان بکڕنەوە، ئەوە ئێوە لەگەڵیاندا ڕێک بکەون و ڕێگەی ئازادییان بۆ ئاسان بکەن، ئەگەر خێرتان تێدا بەدی دەکردن و لەو ماڵ و سامانەی کە خوا پێی بەخشیون بەشیان بدەن و بەزۆر کەنیزەکەکانتان هان مەدەن بۆ داوێن پیسی، ئەگەر ئەوان پاک داوێنیان دەویست(دەبێت پیاوی ئازاد زیاتر پاکداوێنی مەبەست بێت)، بۆ ئەوەی لەو ڕێگە چەوتەوە ماڵ و سامانی ژیانی دنیا بەدەست بهێنن، جا ئەوەی بەزۆر ئەو گوناهەیان پێ بکات، ئەوە بەڕاستی خوا دوای ئەو زۆر بۆ هێنانەیان لێخۆش بوو میهرەبانەو چاوپۆشیان لێ دەکات.

**١٥.** مافی خۆیەتی لە کە فارەتی سوێندا ئازاد بکرێ.

**١٦.** مافی خۆیەتی بە سەدەقە و خێرات ئازاد بکرێ.

**١٧.** مافی خۆیەتی لە کاتی ستەم لێکرانیدا ئازاد بکرێ.

**١٨.** مافی خۆیەتی بیر و باوەڕی ئازادی خۆی هەبێ.

**١٩.** مافی خۆیەتی ژن بێنێ و بە شوو بدرێ.

**٢٠.** دەبێ شوێن و مارەیی و نەفەقەی بۆ دابین بکرێ.

**.٢١** نابێ مەحروم بكرێ لە ژیانی خێزانداری و بڕیار لە سەر بوونی منالْ، هە موو ئەوانە لە ژێر سایەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا جێگای دەبێتەوە كە دەفەرمووێ. وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٣٢﴾ النور

پیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بە بەندە صاڵحەكانتان و كەنیزەكە كانیشتان بدەن بە شوو ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەكات، خوای گەورەش هەمیشە فراوانگیرو زانایە.

**.٢٢** مافی خۆیەتی ئازاد بكرێ لەدوای ئەوەی كە سەیدەكەی دەچێتە لای بەڵام پاشان دەمرێ.

**.٢٣** مافی خۆیەتی ئازاد بێ كە لەگەورەی دایكەكەی لە دایك بووبێ.

**.٢٤** مافی خۆیەتی پێی نەوترێ بەندە، كۆیلە، كەنیزەك، بەڵكو پێی بوترێ كورەكەم كچەكەم ئازیزەكەم.

**.٢٥** مافی خۆیەتی فیری هەموو زانستەكان بێ.

**.٢٦** دەبێ لەكاتی دیاری كردنی خێرێك یان قازانجێك كە دەكرێ بە وەقف بێ بەش نەكرێ و پێی ئازاد بكرێ.

**.٢٧** دەبێ لەكاتی وەسیەت كردندا لە بیرمان بن و بەشێكی باش بۆ ئازادی ئەوان بێ.

**.٢٨** ئەگەر بە گاڵتەش ئازاد بكرێ ئازاد دەبێ.

**٢٩.** لەگەڵ بەندەدا چاک بوون پاداشتی گەورەی هەیە.

**٣٠.**ئازاد کردن و لەگەڵدا چاک بوون و مارەکردنی پاداشتی گەورەی هەیە.

**٣١.** خراپترین خەڵک ئەوانەن لە کۆیلە دەدن.

**٣٢.** پێغەمبەری خوا قەت لە کۆیلەی نەداوە.

**٣٣.** ڕاستی ئەوەیە پێغەمبەری خوا کۆیلەی نەبووە.

**٣٤.** مافی کۆیلەیە هەموو ئەو بۆچوونە فیقهیانەی کە وەک ئاژەڵ و کەل و پەل سەیری دەکەن لابدرێن، یان خوێندکارانیان لێ ئاگادار بکرێتەوە.

**٣٥.** ئەم بۆچوونە برەو پێ بدرێ و زاڵ بکرێ کە ڕێ لە دروست بونەوەی کۆیلە دەگرێ.

**٣٦.** وەڵاتان پابەند بکرێن بەو پەیمان نامە و دەستوورانەی کە ڕێگە لە کۆیلە کردن دەگرن.

**٣٧.** ئەوانەی بڕوایان بە کۆیلە کردن نییە با شەرم نەکەن لە وتنی بۆچونەکەیان، چونکە سەریان بەرزە و پشتیان قایمە بە قورئان و فەرموودە و سیرەت و ژیانی پێغەمبەری ئازیز.

**٣٨.** ئەگەر بە کۆیلە کردن خێر بایە ئازاد کردنی خێر نەدەبوو.

**٣٩.** ئەگەر بە کۆیلە کردن چاک و پەسەند بوایە کەس لە پێغەمبەری خوا شایەنتر نەبوو بەوەی زۆرترین کۆیلەی هەبا:

مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا وَلَا دِينَارًا، وَلَا عَبْدًا وَلَا أَمَةً، وَلَا شَيْئًا، إِلَّا بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ، وَسِلَاحَهُ، وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً.

رواه البخاری ٢٧٣٩،٢٨٧٣،٢٩١٢،٣٠٩٨،٤٤٦١٠ ، ئەمانە بەس ریوایەتی بوخارین.

**٤٠.** لەکاتی خۆی هاوەڵان بەوە دڵی پێغەمبەریان خۆش دەکرد کە کۆیلە ئازاد بکەن، وەک ئەبو هورەیرە کردی، دەی با ئێمەش بەوە دڵی پێغەمبەر خۆش بکەین کۆیلایەتی لە دڵ و عەقڵی خەڵک بسرینەوە.

**٤١.** با نەکەوینە ژێر کاریگەری جوڵانەوە توند ڕەو تەکفیریەکان کە پێ یان وایە بەکۆیلە کردن مافی موجاهیدە و پاداشتی خوایە بۆ ئەوان، وە پێ یان وایە سزای خوایە بۆ ئەوانەی کە بەندایەتی بۆ خوا ناکەن دەبێ بەندەی بەندەکان بن بەڵام لە بیریان چووە ئەگەر ئەمە سزای کافرەکان بێ( کەراست نیە وا نیە)ئەی سزای بەندە سوڵمانەکان بۆ؟!

**٤٢.** دیارە مافی بەندەکان یەکجار زۆرە کە من باسی بکەم بەڵام من بەوە ئیکتیفا دەکەم چونکە دەتوانین بڵێین ئەمانە سەرەکی ترینی مافەکانن.

**٤٣.** دەزانم زۆرێک لە زانایان لەسەر بەشێک لەو مافانە ڕاجیایان هەیە، بەڵام من ئەوەی پێم ڕاسترە ئەوەم نووسیوە، کێش تێبینی هەیە ئێمە لە خزمەتی داین با بۆمان ڕوونبکاتەوە و بۆمان بکاتە دیاری.

# بەشی دەیەم

## کۆیلایەتی لە ڕوانگەی مەزهەبە فیقهیەکانەوە





# کۆیلایەتی لە ڕوانگەی مەزهەبە فیقهیەکانەوە



بەداخەوە دەڵێم مەزاهیبی فیقهی بە هێزترین سەرچاوەی بە شەرعیەت دانانی بە کۆیلە کردنن.

**١.** بەبێ جیاوازی مەزاهبی فیقهی ڕێگایان داوە کە ئیمامی مسوڵمانان لە گەڵ ئەسیردا بە کۆیلە کردن یەکێکە لە هەڵبژاردنەکان دەتوانێ جێ بە جێی بکا لەسەر گیراوەکان.

**٢.** ئەمە کاریگەر بوونە بە مێژووی ڕووداوەکان وەک ئەوەی لە جەنگەکان ڕووی داوە نەوەک کاریگەر بوون بە ئامانجی جەنگ و ڕووداوەکان.

**٣.** ئەم فەتوایە زۆر لە بەرژەوەندی مەلیک و پادشایەکان بووە کە فەتوایان بۆ دراوە ژمارەیەکی زۆر کۆیلە و کەنیزەکیان هەبێ.

**٤.** ئیسلام ئەم هەموو ڕێگایەیەی دانا بۆ نەهێشتنی کۆیلە بەڵام ئەوان بە ئاسانی هەزاران کۆیلەیان دروست کردەوە.

**٥.** فەتوای زانایان بەوەی کە بە کۆیلە و کەنیزەک کردن پاداشتی موجاهیدە لە خواوە بازاڕی گەرمتر کرد بۆ بە کۆیلە کردن.

**٦.** ئەوان فەتوایان داوە لەبەر ئەوەی مامەڵە بە هاوشێوەیە بۆ کافرەکان بۆیە دروستە وەک خۆیان مامەڵەیان لە گەڵدا بکەین :

فمن اعتدى عليكم فاعتدوا بمثل ماعتدى عليكم

**٧.**ڕەچاوکردنی قورئان ئەولاترە لە خوێندنەوەی مێژوو بە بێ ڕەچاوکردنی ئامانجی ڕووداوەکان وەک جەنگەکانی زەمانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام.

**٨.** لە جەنگەکانی پێغەمبەردا ئازاد کردنی کۆیلە داهێنرا نەوەک بە کۆیلە کردن وەک نمونەمان لە سیرە زۆر هێنایەوە.

**٩.** مامەڵە لە گەڵ ئەسیر قورئانی پیرۆز بڕیویەتەوە بە سێ ڕێگا یان کوشتن ئەگەر تاوانباری جەنگ بوو، یان بێ بەرامبەر ئازاد کردن، یان لە بەرامبەر شێک ئازاد بکرێن، بەڵام زانایان گەیاندیانە پێنج ڕێگا، بە کۆیلە کردن، و سەرانە لەسەر دانان.

**١٠.** لە بە شەرعی دانانی بە کۆیلە کردن تووشی بێ شەرعی زۆر بوون، وەک ئەوەی کە دیلەکان مسوڵمان نەبووبن و کافریش بووبن کردوویانن بە خێزانی خۆیان، ئایا دروستە بت پەرست خێزانت بێ یان مەجوسی؟!

**١١.**لە دین دا بەکۆیلە کردنی کەسی ئازاد تاوانێکی گەورەیە، بەتایبەت بێ هۆکاری شەرعی، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ : « قَالَ اللَّهُ : ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ : رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ رواه البخاری «.٢٢٢٧ .

باشە مادام بەدیل هەیە بۆ بە کۆیلە کردن کە ئەسیرییە بۆ فەتوای بە کۆیلە کردن درا!

**١٢.** زانایانی پێشین گەورە بوون، زاناو دانا بوون، بەڵام مەعصوم نەبوون، بۆیە ئاساییە کە بۆچوونی ڕاستر لەوەی وان هەبێ.



**١٣.** با بە بیانووی ڕێزگرتن لە زانایانی پێشین لە مەقاسید و ڕوحی شەریعەت لا نەدەین.

**١٤.** دامانتا فەتوای ئەوان سەدا سەد موافقی شەرع بووە، بۆ ئەوکات وەک (المعاملة بالمثل) کێشەی نەبووە بەڵام بۆ ئێستا ناڕەوایە ئەو فەتوایە بدرێ.

**١٥.** ئایا لە ئێستا دا مسوڵمانان لە کوێی دونیا باڵا دەستن تا بە کۆیلە کردن بۆیان ڕەوا بێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوان ژێر دەست و گیراو و دەست بەسەرو خاک داگیر کراون، بێجگە لە نەهامەتی ئەو فەتوایە چ سوودێکی بۆ مسوڵمانان هەیە.

**١٦.** ئێمە ڕەخنە دەگرین لەوەی دووژمنانی دین دڕندانە ڕەفتار دەکەن لەگەڵ مسوڵمانان لە ڕوسیا و ترکمنستان و بۆڕما و هیندستان و کشمیر و ... بەڵام ئایا بە کۆیلە کرد سەر ناکێشیتەوە بۆ خراپ مامەڵەکردن.

**١٧.** لە مێژووی دەوڵەتی عباسی و عوسمانی ڕەفتاری زۆر خراپ ئەنجام دراوە بەرامبەری کۆیلەکان، ئایا دەکرێ بەس لەبەر ئەوەی مسوڵمان ئەنجامی داوە بڵێین کارێکی باش بووە؟! ئایا ئەوە دەمارگیری و ستەم نییە؟

**١٨.** ئێمە چەندین پەیماننامە و ئیتیفاقیەمان واژۆ کردووە بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی، ئایا ڕەوایە ئێمە پێچەوانەی بجولێینەوە و سەرپێچی بکەین بە کام ئایەت و حەدیسە!؟

**١٩.** ئێمە لەدەستوورەکانی خۆمان ئیمزامان کردووە لە وەڵاتانی ئیسلامی کە نابێ بە کۆیلە کردن هەبێ، وە دەبێ هاوڵاتیان یەکسان بن لە ئەرک و مافیان، باشە کێ مافی ئەوەی هەیە ئەمە هەڵوەشێنێتەوە؟



**٢٠.** ئێمە کاتی خۆی ئازادی کۆیلەمان داهێنا لە جەنگەکان، وە بە دەیان ڕێگای هاندان بە ڕێی واجب و سونەت وەک شەریعەتەکەمان فەرمانی پێکردووە، ئەی بۆ دەبێ ئێستا ئێمە ئاڵا هەڵگری بە کۆیلە کردن بین!؟

**٢١.** دین قورئان و سونەتە نەوەک فەتوای زانایان، وە زانایان قەدر و ڕێزی خۆیان هەیە، بەڵام ئەوان بۆ سەردەمی خۆیان ژیاون، بۆیە فەتوای ئەوان بۆ سەردەمی خۆیانە نەوەک سەردەمی ئێمە، ئەمە لەهەموو شتێکا ڕاست نییە بەڵام بۆ بابەتی کۆیلایەتی و هەڵگەڕانەوە زۆر ڕاستە.

**٢٢.** تکایە ئەمە بە بێ ڕێزی لێک نەدرێتەوە بەرامبەر بەزانیانی ئیسلام لە پێشینەکانمان، بەڵکو ئەوە کار کردنە بە ناوەڕۆکی قسەی ئەوان، چونکە ئەوان ڕای خۆیان دەگۆڕی بەرامبەر بە سەردەمە جیاوازەکان لە بەر جیاوازی سەردەم و هۆکارەکان، خۆزگە ئێمەش وەک ئەوانمان دەکرد و لەوەدا بەوان دەچووین.

**٢٣.** زانایانی زۆری ئەم سەردەمە هەمان ڕایان هەیە لەسەر حوکمی بە کۆیلە کردن و بە ناڕەوایان داناوە، یان لانی کەم ئەو ڕایەیان لا پەسندتر بووە کە بەکۆیلە کردن نەمێنێ.

**٢٤.** بابەتی ئیلغا بوونەوەی کۆیلە بابەتێکی تەواو جێگای موناقەشەیە لەمڕۆدا هەتا ئەوانەی توندیشن بە یەکێک لەهەڵبژاردەکانی بەردەمی ئیمامی مسوڵمانانی دادەنێن و دەیبەستنەوە بە بەرژەوەندی مسوڵمانان، جا نازانم کام بەرژەوەندی مسوڵمانان بە کۆیلەکردن وەدی دێ بێجگە لە ناشیرن بوونی سیستەمی ئیسلامی دەسەڵاتی ئیسلامی لەمڕۆدا.

**٢٥.** من دڵنیام ڕۆژێک دێ زانایانی دیاری ئومەتی ئیسلامی لەسەر نەهێشتن و ئیلغا کردنەوەی بە کۆیلە کردن ڕێک دەکەون بەڵام وەک وتراوە (من لم یؤدبه الوالدان یؤدبه الزمان).

# بەشی یازدەیەم

## جۆرەکانی کۆیلایەتی هاوچەرخ



## جۆرەکانی کۆیلایەتی هاوچەرخ

ڕاستە بە شێوە کلاسیکیەکە بەندە نەماوە لەمڕۆدا، بەڵام بەندایەتی بە شێوازی جیاواز زۆرە.

**١.** بەندایەتی بە شێوەی ڕەچەڵەک: کە ئێستاش گومان دەکرێ لە ئەفەریقا مومارەسە بکرێ لەهەندێک دەوڵەت و لە ناو هەندێک هۆز، بە پێی ئەو ڕاپۆرتەی کە دەزگایەکی ئوسترالی ئامادەی کردووە کە ئەم دەزگایە گرنگی دەدات بە مافەکانی مرۆڤ ئەم دەزگایە ناوی(ووک فری فاوندایشین) ئەم راپۆرتە باس لە بوونی کۆیلە دەکا لە وەڵاتانی هیند، پاکستان، مۆریتانیا، نیبال، هایتی، چین، ئەثیوبیا، نەیجیریا، بە شێوەیەکی بەرچاو.

**٢.** کاری بە سۆغرە و تۆبزی: یەکێک لە جۆرەکانی بەندایەتی تازە، وە لە کۆنیشدا زۆرتر بووە کارکردنی بە ناچاری بە تۆبزی، ئەم جۆرە لە کۆیلایەتی لە هەموو دونیا پیادە دەکرێ.

**٣.** زیندانی کردن و کاری قورس پێکردن: بە داخەوە ستەم لێکراوترین جۆری کۆیلایەتی زیندانی کراوەکانن، وەک گوتراوە زیندانەکان گۆڕستانی زیندوەکانن، بەتایبەتی ئەوانەی دەیانەوێ نەیارە سیاسیەکانیان پاکسازی بکەن، نمونەی هەرە زیندو لە فەلەستین و میسر و تورکمنستان و بۆڕما و زۆر شوێنی تریش هەیە.

**٤.** بە زۆر بەسەرباز کردن و بەناڕەوا جەنگ پێکردن: ئەگەر بە زۆر بەسەرباز کردن وەک ئەرکی نیشتیمانی بێت و بۆ خزمەتی وەڵات بێ و هەموو هاوڵاتیان تێیدا بەشدار بن نکوڵی لێ ناکرێ، وە خەڵکیش

بە ئاسانی پێی قەبوڵ دەکرێ، بەڵام بەسەرباز کردن و شەڕی ناڕەوا پێکردن ئەمە دەچێتە ژێر ناو و مانای بەندایەتی بەشێوازی سەردەمیانە.

**٥.** بازرگانی کردن بە مرۆڤ: ئەمەش خراپترین جۆری بەندایەتییە لەم سەردەمەدا، چونکە ئەم بازرگانیە زۆرە و بە پێ ڕاپۆرتەکانی مافی مرۆڤ دەگاتە ملیونان کەس، ئافرەتان و منالان پشکی شێریان بەرکەوتووە، چونکە جیا لەوەی دەفرۆشرێن بەڵام بازرگانی بە ئەندامانی لاشەیانەوە دەکرێ.

**٦.** بە کۆیلە کردنی گەلان بە هۆی داگیر کردنەوە: ئەو وەڵاتانەی کە داگیرکارن بەردەوام بە چاوی کەمتر لە کۆیلە بەڵکو دووژمن سەیری خەڵکەکە دەکەن، نموونە ئەوەندە زۆرە پێویست بە بەڵگە ناکا تەنیا بریتانیا زیاتر لە نیوەی دونیای لە ژێر دەستدا بوو، ڕوسیا چی خراپی نەکرد بە ویلایەتە ئیسلامیەکان وەک ئەفغانستان و شیشان و داغستان و ئێستاش ئۆکرانیا...

**٧.** کۆیلایەتی دینی: مەبەستم لەو جۆرە کۆیلایەتیەیە کە مرۆڤ وا لێبکا هیچ مەجال بە بیر کردنەوەی خۆی نەدا، هەرچی بە ناوی دینەوە پێی دەوترێ یەکسەر بەدین وەری دەگرێ و دەیەوێ بەسەر خەڵکدا بیسەپێنێ، ئامادە نییە هیچ دانیشتن و بە خۆداچوونەوەیەک بکا لەسەر تێگەیشتنەکانی، وە ئامادەیە خوێن ڕێژی بکا بەناوی دینەوە، بە بێ ئەوەی ئەمە پەیوەندی بەدینەوە هەبێ و دین قازانجی لێبکا، بۆ نمونە وەک شەری شیعە و سونەی سەدان ساڵە، باشە دین چ قازانجێکی لەم دوژمنکاریە کردووە بێجگە لە نەهامەتی و دەربەدەری و ناشیرن کردنی ئیسلام، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ئەو دوو مەزهەبە واز لە ڕابردوو بێنن و بۆ ئێستا بژین و مێژوو تێپەڕێنن؟



**٨.** کۆیلایەتی حیزبایەتی: ئەمە جۆرێکی باوە لەمڕۆدا، چونکە حیزبایەتی کۆبوونەوەی خەڵکانێکی یەکگرتوو یەک قەناعەتن بۆ ئامانجێکی دیاری کراو، بەڵام وا لەخەڵک بکەی هیچ هەڵبژاردنێکی بۆ نەمێنێتەوە و هیچ مافێکی دەست نەکەوێ مەگەر ببێتە ئەو حیزبەی کە هەموو شتی بەدەستە ئەمەش جۆرێکە لە کۆیلایەتی سەردەم.

**٩.** بە کۆیلایەتی کردنی کۆمپانیاکان: بە داخەوە ڕەفتاری بەشێک لە کۆمپانیا گەورەکان ئەوەیە کە کارمەند بە کۆیلە دەکا و ستەمی لێدەکا و مافی خۆی پێ نادا و کاری زیاد و نا پێویستیان پێدەکەن، ئەمەشە جۆرێکە لە کۆیلایەتی.

**١٠.** کۆیلایەتی سیاسی: ئەم جۆرە کۆیلایەتیە وا لە مرۆڤ دەکا هەموو دونیا لەڕوانگەی سیاسەتەوە دەبینێ و دەیەوێ ژیان هەموو بەسیاسی بکا و زۆرترین چەوسانەوەی سیاسی مومارەسە دەکا.

**١١.** بە کۆیلە کردنی ئابوری: کارکردن شتێکی باشە بەڵام دونیای سەرمایەداری بە ستەم دەستی بەسەر ئابووری جیهاندا گرتووە و خەڵکی بێ ئیرادە کردووە و لە بەرژەوەندی کەمینەیەک زۆربەی مرۆڤایەتی ستەمی لێدەکرێ.

**١٢.** بە کۆیلە کردنی کۆمەڵایەتی: جاری وایە پیاو ژن بە کۆیلە دەکا، یان برای گەورە لە ماڵەوە ئەوانی لە خۆی بچوکتر وەک کۆیلە تەماشا دەکا، یان کەسێک بە تۆبزی بە شو دەدرێ...

**١٣.** کۆیلایەتی عەشایەری: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خەڵکانێک هەن کە لە بەرامبەر سەرۆک عەشیرەت و گەورەکانیان خۆیان بە خاوەنی هیچ نازانن و هەرچی پێیان بگووترێ دەیکەن با خراپیش بێ و بێ شەرعیش



بێ، ئەگەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بۆ لایەنی باش و هاوکاری یەکتر بەکار بێ و بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی خراپەبێ کێشەی نییە بەڵکو زۆریش باشە، بۆیە ئەم بوارانە سیلاحی دوو سەرەن بۆ چاک و خراپ بەکار دێن.

**١٤.** بە کۆیلە کردنی ڕۆشنبیری و میدیایی: زۆر دەبینین ئەوانەی دەبنە کارمەند یان ئەندامی میدیایەک دەبێ هەموو شتێک بڵێن و بکەن با هەڵەو ناڕاست و تاوانیش بێ، یان ڕۆشنبیر و نووسەر و میدیایی وا هەیە لە پێناوی موچەکەی هەموو ناهەقیەک قەبوڵ دەکا و ڕاستیەکان پێچەوانە دەکاتەوە.

**١٥.** کۆیلایەتی بۆ شاشەو ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان: ئایا ئەوەندەی گەنجێک مەبەستم هەموویان نیە بەڵام بە شێکی بەرچاووان کاتیان دەدەن بەم ئامێرانە ئایا گەورەکان ئەوەندە کاتی کۆیلەکان دەبەن، مرۆڤ خەریکە لە بەر ئەم ئامێرانە هەموو مافەکان فەرامۆش دەکا و هەموو ئامانجەکانی دوور و نزیکی لە بیر دەکا.

**١٦.** یانە لەش فرۆشەکان و بەکۆیلە کردنی ئافرەت: ئەم بابەتە هێندە بەر بڵاوە بەداخەوە کە خەریکە هەموو دونیا دەتەنێ و وەڵاتانی ئێمەش دەرگای بەڕووی ئەم دەردە پیسە کردۆتەوە. جا جۆرەها ناویان بۆداتاشیوە بۆ ئەوەی بە شێوە ناشیرنەکەی بە گوێی کۆمەڵگا نەگا و ڕەت نەکرێتەوە.

**١٧.** کۆیلایەتی بۆ ئارەزووبازی: هەر غەریزەیەک لە مرۆڤدا دانراوە بۆ دابین کردنە نەوەک کپ کردنەوە بەڵام بە شێوازو بە ڕێی خۆیدا، بۆیە دەبینین بەشێکی زۆر بوونە بەندەی ئارەزووەکانیان و لە پێناوی دابین کردنی حەزی ناشەرعی و پەیوەندی ناشەرعی هەموو شتێک دەکەن و هەموو کەسایەتی و وەفایی خۆیان دەکەنە قوربانی.

**١٨.** کۆیلایەتی بۆ وەرزش: دیارە وەرزش بوارێکی گرنگە لە ژیانی مرۆڤدا بەڵام خەڵکانێک خەریکە لە جیاتی ئەوەی وەرزش ببێتە بەشێک لە ژیانیان ئەوان دەبنە بەشێک لە وەرزش، خۆ ئەگەر ببێتە پیشەو لەو ڕێیەوە ژیانێک بۆ خۆت دابین کەی باشە بەڵام نابێ خۆت و دەور و بەرت بکەیە قوربانی، ئەوە چیە حەزت لە وەرزشە.

دیـــارە جـــۆری تری بەندایـــەتی هەن لەمڕۆدا بەڵام هەر ویستم بیرخستنەوەیەک بکەم لەوەی لەمڕۆژ دا بەندایەتی بە شێوەی مۆدێرن کۆتایی پێ نەهاتووە.

# بەشی دوازدە

## ئایا کۆیلایەتی ئیلغابۆتەوە یان نا؟





## ئایا کۆیلایەتی
## ئیلغا بۆتەوە یان نا؟



لەکۆتایی دەبێ بێینە سەر باسی ئەوە ئایا کۆیلایەتی ئیلغا بۆتەوە لە شەریعەتی ئیسلامدا یان نا؟

**دیارە لەم بابەتەدا سێ بۆچوون هەیە:**

**یەکەم:** پێی وایە ئیلغا نەبۆتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی لەقورئان دا باسی کراوە و بە حەڵال دانراوە بە دەقی ئایەت خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّـٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّـٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَـٰلَـٰتِكَ ٱلَّـٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٥٠﴾ الأحزاب

خوای گەورە دەفەرموێ ئەی پێغەمبەر ئێمە حەڵاڵمان کردوە بۆت ئەو خێزانانەت کە مارەییان پێ دەدی، وە ئەو کەنیزەکانەی کە خوای گەورە دەیخاتە دەستت، کەواتە مادام خوای گەورە حەڵاڵی کردبێ کەس ناتوانێ قەدەغەو حەرامی بکا.

• وە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَـٰفِظُونَ ٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ٦﴾ المومنون

• لەم ئایەتانەدا خوای گەورە حەڵاڵی کردووە بۆ پیاوان خێزان و کەنیزەکەکانیان. مادام خوای گەورە ڕێگای پێداوە پیاو بچێتە لای کەنیزەک کەس ناتوانێ قەدەغەی بکا.

• وە بە بەڵگەی جەنگەکانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام چونکە لەو جەنگانەدا کەنیزەک گیراوە و کراوە بە خێزان، ئەوە مانای بە شەرعی بوون دەگەیەنێ.

• وە بەبەڵگەی مێژوو: لە مێژووی ئیسلامدا جەنگ هەبووە و کەنیزەکیش هەبووە، ئەمەش بەڵگەی شەرعی بونە.

• وە بەڵگەی قسەی زانایان: زانایانی ئیسلامی لە هەموو مەزهەبەکان ڕێگایان داوە گیراوی پیاو و ئافرەت بکرێن بە کۆیلە و کەنیزەک.

• وە بە بەڵگەی مامەڵە کردنی هاو وێنە، مادام ئەوان لە کاتی گرتندا ئێمە بکەن بە کۆیلە بۆ ئێمەش ڕەوایە هەمان ڕەفتار ئەنجام دەین بەرامبەریان.

**دووەم:** خاوەنی ئەم بۆچوونە پێی وایە ئیمام ئازادە لەوەی چۆن ڕەفتار لە گەڵ گیراوەکاندا دەکا، هەر وەک زاناکان چوار یان پێنج هەڵبژاردەیان داناوە لە بەردەم ئیمامی مسوڵماناندا کامەیان جێ بەجێ بکا ئازادە، یەکێک لەو هەڵبژاردانە بە کۆیلە کردنە، ئەمەش بە ڕوونی لە هەموو کتابە فیقهیەکاندا هەیە.

**سێیەم:** بەکۆیلە و کەنیزەک کردن ئیلغا بۆتەوە و کۆتایی پێ هاتووە، ئەنجام دانی دەچێتە ناو بازنەی تاوانەوە بە پێی ئەم بەڵگانە:

**١.** قورئانی پیرۆز لە هیچ شوێنێک خەڵک هان نادا بۆ خەڵک بە کۆیلە کردن، بە ڵکو بە پێچەوانەوە خەڵک هان دەدا بۆ ئازاد کردنی کۆیلە یەکەم

بە شێوەی واجب، دووەم بە شێوەی سونەت هاندان زۆرە لە قورئان و سوونەتدا کە بە درێژی بەڵگەکانمان باسکردن.

**٢.** لە هیچ شوێنێک سونەت خەڵک هان نادا بۆ بە کۆیلە کردن، بەڵکو سونەتیش وەک قورئان هانمان دەدا بۆ ئازاد کردنی کۆیلە یان بە شێوەی واجب یان بە شێوەی بڕیاردانی پاداشتی قیامەتی.

**٣.** لە سیرە دا پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام ئازاد کردنی کردە پیشە نەوەک بە کۆیلە کردن وەک باسمان کرد لە ئازاد کردنی کۆیلە لە جەنگەکاندا.

**٤.** نە لەقورئان نە لەسونەت کەمترین پاداشت باس نەکراوە بۆ بە کۆیلە کردن، ئەگەر کارێکی باش با دەبوو پاداشتی لەسەر با، بەڵام بە پێچەوانەوە بۆ ئازاد کردن گەورەترین پاداشتی لەسەر وتراوە.

**٥.** ئەوەی بەسەر بەنی قورەیزە دا جێبەجێکرا ئەگەر بڵێین بەکۆیلەکراون (بەڵام ڕاستر ئەوەیە کە دیل بوون) ئەمە دەچێتە بازنەی خیانەتی گەورە و جاسوسی و تیرۆرستی و کودەتا و مافیا گەرایی کە ئەمە ئیستاشی لەگەڵدا بێ سزای کوشتنیان هەیە.

**٦.** ئەگەر بڵێی ئەی بۆ لە قورئاندا حەڵاڵ کراوە وەک باسکرا؟ وەڵام ئەوەیە کە کۆیلە هەبووە ئەگەر حەرام با زەواجی لەگەڵدا بکرێ و ژنی بۆ بهێنرێ ئەی چی لەگەڵدا کرابا، هاوسەر گیری لە سەرەتایترین مافەکانی مرۆڤە، باشە بۆلێی مەحروم بێ، وە چ سودێک بە کۆیلە و کەنیزەک دەگەیەنێ؟

**٧.** ئەوەی کە ڕوویداوە لە زەمانی پێغەمبەردا ئەوە بووە کە پێغەمبەر پێی مەحکوم بووە بەو نەریتەی کە لەو کاتدا باو بووە، چونکە ئەو نەیتوانیوە هەر لەیەکەم جاردا کۆتایی بەم یاسا بەربڵاوە بێنێ کە لەناو عەرەبەکان و

هەموو دونیای ئەوکات باو بووە. مەبەستم کۆیلایەتییە، ئەوەی کە گرنگە پێغەمبەری خوا هەوڵی داوە کۆیلە نەمێنێ یان نا؟ بێگومان هەوڵی چڕ و پڕی دا بەو تەشریعە چڕ و پڕەی کە لە قورئان و سونەت دا هاتبوون.

**٨.** ئەوەی کە بەسەر بەنی قورەیزە داهات دەقی شەریعەتی تەوراتە کە بەسەریاندا جێ بە جێکراوە، چونکە سزای ئەسیر یەکێک لەهەڵبژاردەکان بە کۆیلە کردنە لە دینی جولەکەدا، سفری تەسنیە، ١٨-١٩-٢٠

**٩.** قاعیدەیەکی جوان هەیە کە دەڵێ( الاعتبار بكمال النهاية لا بنقص البداية) کەواتە ئەم شەریعەتە لەسەرەتا کامڵ و تەواو نەبووە خوای گەورە لە دوای بیست و دوو ساڵ دەفەرموێ: اليوم أكملت لكم دينكم، لە سەرەتا ئەمەی نەفەرمووە.

**١٠.** پێغەمبەری خوا کە وەفاتی کردوە کۆیلە و کە نیزەکی بە جێ نەهێشتەوە، ئەوەی پێغەمبەری خوا دەیکا دینە و پێوەرە بۆ حوکمە شەرعیەکان نەوەک ئەوەی پادشاو زاناکان بە ڕەوایان داناوە.

**١١.** ناگونجێ بڵێی بەندایەتی هەبێ ستەم نابێ، ستەمیش نەهی لێکراوە لەشەرعدا بۆیە پێش ڕوودانی دەبێ ڕێی لێبگرین.

**١٢.** بە پێی مەقاسیدی شەریعەت هیچ بەژەوەندیەک لە بوونی کۆیلەکردندا نییە بەتایبەت لەمڕۆدا.

**١٣.** بە پێی یاسای(سد الذريعة) نابێ باس لە کۆیلە کردن بکەین، چونکە سەردەکێشی بۆ زوڵم و ستەم، وە مسوڵمانان زیانی لێدەکەن چونکە مسوڵمانان لە حاڵەتی لاوازی و بێ دەسەڵاتیدان.

**١٤.** ئێمە جاڕنامەکانی مافی مرۆڤمان ئیمزا کردووە کە تێیدا هاتووە بەکۆیلە کردن و بازرگانی کردن بە مرۆڤ دروست نییە ئەدی ئەمە پەیمان بەستن نییە؟ وە وەفا بە پەیمان واجب نییە با لەگەڵ دوژمنیش بێ؟

**١٥.** ئێمە لەدەستوری وەڵاتەکانماندا بەکۆیلایەتیمان بە حەرام داناوە و باسی یەکسان بوونی هاوەڵتیانمان کردووە لە ئەرک و مافەکان و لە بەرامبەر دەستور و قەزادا، ئایا ڕەوایە ئەوەی کە خۆمان دەنگمان پێداوە و ئیمزامان کردوە پێیەوە پابەند نەبین؟!

**١٦.** لە مادەی ١٤ دەستوری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥ دەڵێ: العراقيون متساوون أمام القانون دون تمييز لسبب الجنس أو العرق أو القومية أو الاصل أو اللون أو الدين أو المذهب أو المعتقد أوالرأى أو الوضع الاقتصادى أو الاجتماعى،

وە لەمادەی ٣٧ دەڵێ:

أولا: حرية الانسان وكرامته مصونة.

ثانيا: تكفل الدولة حماية الفرد من الاكراه الفكرى والسياسى والدينى.

ثالثا: يحرم العمل القسرى( السخرة) والعبودية وتجارة العبيد(الرقيق) ويحرم الاتجار بالنساء والاطفال والإتجار بالجنس.

- وە لەدەستوری ئەردەنی مادەی ٧.
- وە لە دەستوری بەحرەینی مادەی ١٩.
- وە لەدەستوری سودانی مادەی ٢٠.
- وە لە دەستوری صۆمالی مادەی ١٧.
- وە لەدەستوری سوری مادەی ٢٥.

- وە لە دەستوری عومانی مادەی ١٨.
- وە لە دەستوری قەتەری مادەی ٣٦.
- وە لە دەستوری لوبنانی مادەی ٨.
- وە لە دەستوری میسری مادەی ٤ .

باس لە بە حەرام كردنی بازرگانی كردن بە مرۆڤ كراوە بە تایبەت ئافرەتان و منالان.

**١.** لەوانەیە بوترێ ئەگەر ڕۆژێک هات لە گەڵ دوژمنان بوو بەجەنگ و ئەوان ئێمەیان كردە كۆیلە، ئایا بۆ ئێمەش ڕەوا نییە مامەڵەی هاوشێوەیان لەگەڵدا بكەین؟

وەڵام ئەوەیە:

**یەكەم:** حاڵەتی كۆیلە بە شێوە كلاسیكیەكە كۆتایی پێهاتووە.

**دووەم:** ئەوكات با ئێمە لە خەڵک باشتر بین شەرت نییە وەڵامی خراپە بە خراپە بدەینەوە.

**سێیەم:** دەبێ جارێكی تر یاسا نێو دەوڵەتیەكان بگۆڕێن بۆ ئەوەی جێگای بەندایەتی تێدا بكرێتەوە، وە لە كۆتاییدا ئەگەر هەموو دونیا ئەوەی پەیڕەو كردەوە زانایان لەوكاتدا قسەی خۆیان دەبێ با ئێمە لە جیاتی ئەوان فەتوا نەدەین.

**٢.** دەبێ ئەوەش بڵێم ئێمە لە بێ دەسەلاتیدا هەرەشەی گەورە دەكەین، خەڵكانی تر لەو پەڕی دەسەلاتدان بەلام باس لە نارەوای كۆیلە دەكەن و باسی مافی مرۆڤ دەكەن، ئایا ئەوەی ئەوان ڕاسترە یان هی ئێمە؟!

**٣.** هەر کەس ئەگەر قورئانی پیرۆز و سونەت و سیرەتی پێغەمبەری ئەزیز و مەقاسیدی شەریعەت و بەرژەوەندی مسوڵمان و روحی دین ڕەچاو بکا زۆر بە ئازادانە و ئازایانە دەڵێ جارێکی تر بە کۆیلە کردنی مرۆڤ و زیندو کردنەوەی شەریعەتی ستەم کاران(کە کۆیلایەتیان داهێناوە) کارێکی خراپە نەوەک ڕەوایە کە بەرامبەر ئیسلام و مسوڵمانان دەکرێ.

**وصلى الله وسلم على محمد النبى وسلم تسليما كثيرا**

مجموعة الابحاث القرآنية / لمصطفى ابراهيم الزلمى / الجزء الحادى عشر

الموسوعة الفقهية الكويتية/ المجلد الثالث والعشرون

## کۆتـــایی

**لە کۆتایی ئەم کتابەدا بابەتەکان لە چەند خاڵێکدا کورت دەکەمەوە:**

**١.** کۆیلایەتی سیستەمێکی ستەمکارانەیە دەسەڵاتدارەکان لە بەرژەوەندی خۆیان دایانهێناوە و برەویان پێداوە و بە یاسا و نەریتیان کردووە.

**٢.** کۆیلایەتی مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و کاتی داهێنانەکەی دیار نییە، بە دڵنیایی دەگەڕێتەوە بۆ پێش نووسینەوەی مێژوو.

**٣.** لە هەموو دونیا داو لە ناو هەموو شارستانیەتەکاندا کۆیلایەتی کەم و زۆر هەبووە.

**٤.** زۆر جار دین بە کار هێنراوە بۆ پاڵپشتی کردن لە بە کۆیلە کردن .

**٥.** سەرچاوەی بەهێزی دروست بوونی کۆیلە ئابووری و جەنگەکان بوون.

**٦.** ئیسلام لە میانەی دەقەکاندا بەرنامەی چڕ و پڕ و وردی دانا بۆ نەهێشتنی کۆیلە.

**٧.** پێغەمبەری خوا هیچ کەسێک بەناوی کۆیلە لەماڵیدا نەبووە، ئەوە دەڵێ بووە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزو سونەتی سەحیح بڕیاری داوە.

**٨.** لە مێژووی هەموو مرۆڤایەتی بە گشتی و مێژووی ئیسلامیشدا بە تایبەتی کۆیلایەتی لە جەنگەکاندا مومارەسە کراوە.

**٩.** فەتوای زانایانی پێشین دەرگای زۆر والا کردووە لەبەردەم بە کۆیلەکردن بەداخەوە.

**١٠.** بە پێى دەقى قورئان و فەرمودە و سيرەى سەروەرمان و مەقاسيدى شەريعەت و ئەو پەيماننامانەى كە واژۆمان كردووە و ئەو دەستورانەى كە نووسيومانەوە نابێ ئێمە جارێكى تر دان بە كۆيلايەتى بنێين و بە بيانوو پاساوى جياواز نەيشەرعێنين.

**١١.** ئێمە هيچ بێڕێزيەكمان بە زانايانى پێشين نە كردووە و لە جياتى زانايانى داهاتووش قسە لە سەر كۆيلايەتى ناكەين، بەڵام دەبێ ئەوە بزانين لە مەقاسيدى شەريعەت ئازاد كردنى كۆيلەيە نەوەک بە كۆيلە كردن.

**١٢.** لە كۆتاييدا دەڵێم ئەوەى كە لەم كتابەدا نووسيومانە و كۆمانكردۆتەوە خۆم لێى بەرپرسم و وە بەرپرسياريەتى هەڵدەگرم، وە ئەگەر شتێكى هەڵەمان نووسيبێ سوپاسى ئەو كەسە دەكەم كە هەڵەكانمان بۆ دەكاتە ديارى.



## سەرچاوەکان
## لە دوای قورئانی پیرۆز




- تفسير الطبرى
- تفسير القرطبى
- التفسير  الكبير
- تەفسیری ڕامان
- پوختەی تەفسیر
- تەفسیری ئاسان
- تەفسیری هەژار
- صحيح البخارى
- صحيح مسلم
- سنن النسائي
- سنن أبوداود
- سنن الترمذي
- سنن إبن ماجه
- سنن الدارمي
- موطأ إمام مالك

- مسند إمام أحمد
- زرادشت والديانة الزرادشتية\ المكتبة الالكترونية الكردية
- التورات السامرية، دكتور منذر الحايک
- ڤيدا نصوص هندوسية مقدسة، دراسة مقارنة، دكتور منذر
- الكتاب المقدس
- السيرة النبويه : لابن هشام
- السيرة الصحيحة . لدكتور أكرم ضياء العمرى
- السيرة النبوية: للصلابى
- البداية والنهاية :لابن كثير ج ٣-٦
- السيرة النبوية : لابن هشام
- صحيح تأريخ الطبرى : تحقيق محمد بن طاهر البرزنجى
- السيرة النبوية للصلابى
- مجموعة الابحاث القرآنية / لمصطفى ابراهيم الزلمى/ الجزء الحادى عشر.
- الموسوعة الفقهية الكويتية/ المجلد الثالث والعشرون
- الرق، ماضيه و حاضره، عبدالسلام الترمانينى
- الرق فى الإسلام، احمد شفيق
- نظام الرق في الإسلام، عبدالله ناصح علوان
- فضاءات الحريه، سلطان بن عبدالرحمان العميرى

- كتاب الرق و الرقيق في العصور القديمة و الجاهلية و صدر الإسلام، فاطمة قدورة الشامى
- الرق فى الجاهليه والإسلام، محمد ابراهيم حسن
- نظام الرق عبر العصور، دولة الإمارات العربية المتحدة، مركز زايد للتنصيق والمتابعة

## نـــــاوەڕۆك